




وەزارەتی رۆشنبیری ولاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بلاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی

● عەشق و شەیتانەکانی دی

● نووسینی: گابریل گارسیا مارکیز

● وەرگێڕانی بۆ فارسی: ئەحمەد گولشیری

● وەرگێڕانی لە فارسییەوە: مستەفا مەعرووفی

● نەخشەسازی ناوەوە: ڕەسوول سوڵتانی

● بەرگ: جێگر عەبدولجەبار

● چاپی یەکەم: ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● نرخ: ٣٠٠٠ دینار

● چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی٦١٧ ی ساڵی ٢٠١١ پێدراوە.

زنجیرەی کتێب (٦١٨)

ئەم کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەم ماڵپەڕە هەیتنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمێل: info@mukiryani.com

رۆژی ٢٦ی ئۆکتۆبری ١٩٤٩ رۆژێك نەبوو کە هەواڵی گرنگی تێدا بێ. مامۆستا کەلمینتێ مانۆئێل زابالا سەرنووسەری رۆژنامە، کە یەکەم هەوڵەکانی نووسینم وەك هەواڵنێر لەلای وی ئەنجام دەدا، بە دوو یان سێ پێشنیاری سادە کۆتایی بە کۆنفرانسی بەیانیی خۆی هێنا. ئەو کارێکی وای بە هیچ یەك لە بەڕێوەبەرانی رۆژنامە نەسپارد. چەند دەقە دواتر پێیان راگەیاند کە هەر ئێستا گۆڕستانی پەرستگەی پێشووی سانتا کلارا هەڵدەکۆڵن .سەرنووسەر بەبێ هیچ چاوەڕوانییەك منی راسپارد:

" برۆ سەری ئەوێ بدەو بزانە رات چیە."

پەرستگەی مێژوویی کلاریسییەنەکان لە سەد ساڵ پێشترەوە لە جیاتی نەخۆشخانە کەڵکی لێوەردەگیرا. ئەم پەرستگەیە دەبووا بفرۆشرابووایە تاکوو هوتێلێکی پێنج ئەستێرەی لە جێ دابنێن. ژووری تەنیشتو بە نرخی پەرستگە بەهۆی هەڵوەرینی بانی خشت لە ئاکامی تێپەڕینی کاتدا تا رادەیەك بەبێ لەمپەر کەس خۆی تێ نەدەگەیاند. بەڵام هێشتا سێ نەسل لە ئۆسقۆفەکان، راهیبەکانو بژاردەکانی دیکە لە ژێرزەمینە مەرمووزەکانی دا لە بن عەرزی دا بوون. یەکەم هەنگاو ئەوە بوو کە گۆڕەکان بەتاڵ بکەن، ئێسكوپروسکی مردووەکان جیا بکەنەوەو لەلایەکیان دابنێنو ئینجا ئەوانی دیکە لە گۆڕێکی بەکۆمەڵدا بنێژن.

سەرم لە هەڵس‌وکەوتی رەمەکی‌وگەللایی لەگەڵ گۆڕەکان سوڕ ما. کرێکارەکان گۆڕەکانیان بە پاچو کولێنگ هەڵدەکەند، تابووتە بۆگەنیوەکانیان دەردەکێشانو هەرکە دەیان جووڵاندن لەبەریەك هەڵدەتەکانو ئێسکەکانیان لە جلوبەرگە تۆزاویو پرچە

ئالۆزکاوەکانیان جیا دەبۆوە. مردووەکان هەرچەندە پلەوپایەیان بەرزتر بووایە، بەو رادەیەش کارلەسەرکردنیان بەزەحمەت بوو، چونکە دەبووا تەرمەکان بێنەدەرێ پاش پشکنین بەردە بەنرخەکان، زێڕو خشڵەکانیان بدۆزنەوە.

مامۆستا بینا بە مەودای دیاریکراو مێژووی بەردەنووسەکانی لە دەفتەرچەیەکی قوتابخانانداا دەنووسیو ئێسکەکانی کۆمەڵکۆمەڵو بە ڕێکوپێکی لە پەنا یەکتری دادەناو کاغەزێکی بە ناوی مردووەکەوە لەسەر هەرکامیان دادەنا تاکوو هەڵەیەک روو نەدا. یەکەم شت کە پاش چوونم بۆ پەرستگە سەرنجی رادەکێشا، ریزی دووروودرێژی ئەو ئێسکانە بوو کە بەهۆی هەتاوی گەرمی ئۆکتۆبرەوە کە لە درزی بانەوە دەهاتە ژوورەوە، گەرمتر داهاتبوون. ناسنامەی هەرکام لەوان بە هۆی یادداشتێکەوە دەناسرایەوە کە بە قەڵەم رەساس لەسەر کوتە کاغەزێک نووسرابوو. باش تێپەڕینی نیوسەدە هەستم بە شۆکێک کرد کە بەڵگەیەکی راچڵەکێنەر لە رەهەندی وێرانی مێژووەوە لە منی دا پێک هێناوە.

لەوێ لەپەنا ژمارەیەکی زۆر مردووی دیکە، جێگری پاشای پیرۆ و دڵبەرە نهێنییەکەی، دۆن توریبیۆ دیکازەرەس یی ڤیرتودوس ئۆسقۆفی ئیدارەی ناوچەی ئۆسقۆف، گەلێک راهیبەی دیکە لە نێویاندا، دایکە ژۆزێفا میرانداو دۆن کریستۆبال دی ئاسڤارا خاوەنی پلەی زانستیی بەشە هونەرییەکان کە نیوەی ژیانی خۆی بۆ مونەببەتکاریی بن میچەکان تەرخان کردبوو لە خەوی هەمیشەیی دابوون. گۆڕێکی لێ بوو کە بە بەردی گۆڕی مارکیزی دووەم دۆن ئیگنا چیۆ ئالفارۆ دونەناس لە کاسیلدێرئۆ داپۆشرابوو. بەڵام کاتێک کردیانەوە، بەتاڵ بوو و هیچ کات بەکار نەهێنرابوو، بە پێچەوانە پاشماوەی لەقەبی خانەدانیی دونا ئولالا دی میندۆزا لەگەڵ بەردی گۆڕەکەی لە قولکەی تەنیشتێی دا بوو. مامۆستا بینا بۆچوونێکی تایبەتیی نەبوو: دەکرا وای بۆ بچی کە یەکێک لە لە کەسانی خانەدانە کۆچکردووەکانی ئەمریکای لاتین بێ کە بەرەچەڵەک رۆمی بووە ، گۆڕی خۆی دیاری کردەوە، پاشان لە گۆڕێکی دیکە دا نێژراوە.

له سێیەمین قولکەی مێحرابی سەرەکیدا، لە پەنا کتێبی پیرۆز گۆڕێك هەبوو. بەردی گۆڕ بە یەکەم کولێنگ لەتوپەت بوو و بسکێکی کاڵو رەنگ مزی بە کەلێنەکەیدا دەرکەوت. مامۆستا بینا هەوڵی دا بە یارمەتیی کرێکارەکانو بێ ئەوەی زیانی پێ بگا، بێنێتە دەرێ، بەڵام هەرچی پرچیان زیاتر رادەکێشا، جوانیو گەشیەکەی زیاتر درێژەی دەکێشا، سەرەنجام کۆتایی مووەکان بە کەللە سەری منداڵێکەوە بوو کە لە نێو قولکەدا کۆمەڵێکی بچووك لە ئێسكو پروسکی لەبەر یەك هەڵتەکاو بەجێ ما. لەسەر کێلێك کە لە دیواری درابوو و بە هۆی ئەسیدی نیتریك خورابوو، تەنیا ناوێکی بێ لەقەب بەجێ مابوو: سیەرڤا ماریا دی تودوس لۆس ئانجەلێس. پێچی زولفی درێژی ئەم منداڵەیان پێوا کە لەسەر عەرزی راخرابوو، بیستو دوو مەترو یازدە سانتیم بوو.

مامۆستا بینا بە لەسەرخۆیی تەواوەوەو بەبێ کەمترین پەژارەوە بۆی باس کردم کە مووی مرۆڤ تەنانەت پاش مردنیش مانگێ یەك سانتی مەتر هەڵدەداو بیستو دوو مەتر پاش تێپەڕینی دووسەد ساڵ بە بۆچوونی وی هەڵدانێکی باشە. بە پێچەوانەوە بە رای من ئەم مەسەلەیە زۆر ئاسایی نەبوو، چونکە لەسەردەمی منداڵیمدا دایەگەورەم باسی ئەفسانەی کچۆڵەیەکی دوازدە ساڵەی خانەدانێکی کردبوو کە ئاڵقەی بسکیی وەك داوێنی بووکێ بە دوای خۆی دا کێشاوە، کچۆڵە بە هاری مردبوو. لە گوندەکانی کارائیب بە هۆی ئەوەی گەلێك موعجیزەی هەبوون بە باشی باسیان دەکرد. ئەم بۆچوونە کە ئەم گۆڕە دەکرا گۆڕی ئەو کچە بێ، ئەو رۆژە بۆ من وەك هەواڵێكو سەرەتایەکی ئەم کتێبە وابوو.

گاربریەل گارسیا مارکیز ــ کارتاگەنا دی ئیندیاس ١٩٩٤

# ١

**لە بارەی عەشق و شەیتانەکانی دیکەوە**

سەگێکی رەنگ دووکەڵ کە هێڵێکی راستو چەپی بە نێوچاوانیەوە بوو لە یەکەم یەکشەممەی مانگی دیسامبردا لە کوێرەرێیەکەوە بەرەو بازاڕ وەڕێ کەوت. دوکانی کەبابفرۆشییەکانی تێک داو زیانی بە هیندییەسوورەکان گەیاندو شوێنی بیتاقەی شانسوبەختەکانی شێواندو وێڕای ئەمانەش قەپی لە چوار کەسی سەر رێگای خۆی دا. سێ کەسیان کۆیلەی رەشپێست بوونو ئەوی دیکەشیان سییەرڤا ماریا دوتودوس لۆسئانجلێس تاقانە کچی مارکیز لە کاسلدۆئیرۆ بوو کە لەگەڵ کارەکەرێکی چووبووە بازاڕ بۆ ئەوەی ملوانکەیەکی بە موورروو بۆ دوازدیەمین ساڵرۆژی لەدایکبوونی بکڕێ.

فەرمانیان پێ کردبوون کە نابێ لە دەروازەی سەرەکیی دێلس مێرکادە بەولاتر برۆن، بەڵام کارەکەرەکە هەتا دەروبەری لۆتکە لە گەرەکی گیتسە مانی رۆیشتو لە نێو قەرەباڵغیی بەندەری کۆیلەکاندا ، ئەو جێیەی بارێك لە رەشپێستەکانی گینەیان لێ هەرزان فرۆش دەکرد، ون بوو. خەڵك لە حەوتووی رابردووەوە بە نیگەرانیەوە چاوەڕوانی کەشتیی کۆمپانیای گادیتانا دینگرۆس بوون کە لەبەر هۆیەکی نادیار ژمارەیەك لە کۆیلەکان لە سەر کەشتییەکە گیانیان لەدەست دابوو. بۆ ئەوەی رووداوەکە بشارنەوە بێ ئەوەی کەشتییەکە رابگرن تەرمەکانیان فڕێ دابوونە نێو ناوێ. شەپۆلی دەریا وەقەراغ ناوێی دابوونو بەیانیی یەکێك لە رۆژەکان تەرمەکان زۆر سەیر هەڵمسابوونو داڵاشەکان لە لێواری پەیدابوون. لەبەر ئەوەی رەنگ بوو تاعوونی ئەفریقایی بڵاو ببێتەوە، کەشتییەکە لەوبەری کەنداوی بچووك لەنگەری گرتبوو. ئاخیرەکەشی دەرکەوت هۆی سەرەکی مەسموم بوون بە گۆشتی رزیو بووە.

کاتێك سەگەکە وەنێو بازاڕێ کەوت، پاشماوەی باری ئەو مرۆڤانەی لە وەزعێکی ناخۆش دابوون و لە حاڵێکدا نەخۆش بوون بە نرخێکی کەم هەڕاج کران. تەنیا یەکێك لەوان کە لەوانی دیکە بەنرختر بوو و خاوەنەکان هەوڵیان دەدا بە فرۆشتنی وی زیانەکانیان قەرەبوو بکەنەوە، دیلێکی حەبەشی بوو. کچێکی کورتەباڵا، بە لووتێکی باریك و سەرێکی درێژ و ددانی ساغەوە کە لە جیاتی ئەو ڕۆنانەی باون، شیلەی چەوەندەری دەخۆی هەڵسووبوو. زۆر جوان و خاوێن بوو. بە ڕەفتاری نارام و لەسەرەخۆی لە کاتی هاتنە ژووردا، وەك گلادیاتۆرەکانی ڕۆمی دەچوو. تۆمەتی کرێژی سەری پێوە نەدەنووسا یان بە ئاشکرا باسی نەخۆشی و پیریی هەڵنەدەگرت. ئەوەندە جوان بوو کە شارەدار بەبێ موناقشە مەبلەغێکی بارتەقای زێڕی هاوکێشی وی دا بە خاوەنەکەی.

هەموو ڕۆژێ سەگە بەرەڵڵایەکان لە شەقامەکان پشیلەکانیان ڕاودەنا یان لەگەڵ داڵەکان لەسەر کەلاکان لێیان دەبوو بە شەڕ، ئەویش ڕاست لەو کاتەدا کە دەرزیت هەڵاویشتبا لەبەر خەشیمەت وەعەرزی نەدەکەوت و کەشتیی شەڕی لە سەر ڕێگای خۆی بەرەو وێستگەی پۆرتۆبیلوو ڕادەوەستا. لەو ڕۆژەدا چوار پێنج کەس یەك لەوان سییەرڤا ماریا کەوتنە بەر هێرشی سەگان، کچۆڵە، سووکە برینێکی هەڵگرت. کارەکەر لەسەرخۆو بێ ئەوەی بشڵەژێ شوێنی برینەکەی پشکنی و پەڵەیەکی خوێنی کە بە لاقی رووشاویەوە بوو شوردەوە. ئێستا جگە لە کۆڕی جێژنی دوازدەیەمین ساڵڕۆژی لەدایکبوونی سییەرڤا ماریا کەس بیری لە شتێکی دیکە نەدەکردەوە.

بێرناردا کابێرەڕا دایکی کچۆڵە و هاوسەری بێ لەقەبی مارکیز لە کاسلدۆئێرۆ، سەرلەبەیانییەك دەرمانی زگچوونی خورادبوو: حەوت دانە توتیای کانزایی لەگەڵ شەکر لە پەرداغێکیدا. ئەو دوورەگەیەکی لەخۆبایی و بەقەول لە ڕیزی خانەدانە دوکاندارەکان بوو. دڵڕفێن و لەبارو بەدەماغ بوو و ئامێزە برسییەکەی دەرەقەتی سەربازخانەیەکی دەهات. لەماوەی تەنیا چەند ساڵێکدا بەهۆی زیادەڕۆیی لە خواردنی هەنگوینی قاڵبۆوەو لەتکە کاکاو گیانی لەدەست دا. لەم دواییانەدا چاوەگەشەکانی لێڵ ببوون، هۆشی لەدەست دابوو، خوێنی لەگەڵ پیسایی دادەنا و زەرداوی دەهێنایەوە. لەش و لارە دڵڕفێنەکەی پێشووی هەڵمسابوو و وەك مردووان ڕەنگی مزی لێ نیشتبوو. شەقە تڕی وای لێ بەردەبوو کە سەگی حەرەسانی دەترساند. کەم وابوو ژووری بەجێ بێڵێ، لە کاتی هاتوچۆدا بەتەواوی رووت بوو یان رووپۆشێکی دەستچنی بەخۆی دا دەدا. لەوکاتەدا رووتتر دیار دەبوو.

لەوکاتەدا کە سییەرڤا ماریا و کارەکەرەکە دەهاتنەوە ماڵێ، بێرناردا حەوت جاران چووەبووە ئاودەستێ و کارەکەر لە بارەی هێرشی سەگەکان بۆسەر سییەرڤا ماریا هیچی پێ

نەگوت. لە جیاتی ئەوە باسی ئالۆزیی بەندەرو فرۆشتنی ژنە کۆیلەکەی بۆ کرد. بێرناردا گوتی: " ئەگەر ئەوەندە جوانە وەکی ئێوە دەڵێن، ڕەنگە حەبەشی بێ، بەڵام ئەگەر کچی کافرۆشیش بێ ئەقڵ نایگرێ بەزێڕی هەڵکێشرابێ." ئینجا گوتی:" ڕەنگە مەبەستتان پێزۆی زێڕ بێ."

پێیان گوت " نا، زێڕ بەقەد قورسایی کچە ڕەشپێستەکە."

بێرناردا گوتی:" کۆیلەیەکی قوڵەبنە کێشی لە شێست کیلۆ کەمتر نابێ. چ ڕەش بێ و چ سپی، هیچ کۆیلەیەك نیە کە شێست کیلۆ زێڕی بێنێ، ئەگەر وابێ حەتمەن ئەڵماس دەڕێ!."

لە کاتی کڕین و فرۆشتنی کۆیلەکاندا کەس بەقەد کارەکەرەکە بێ ئۆقرە نەبوو. بیری بەوڕاستییەوە خەریك بوو کە شارەدار کچە حەبەشییەکەی بۆ کارێکی دیکەی جگە لە خزمەت لە مەتبەخدا دەوێ. کاتێك یەکەم ئاوازی فلووت و یاریی ئاگر و چەق‌ولووری سەگە بەستراوەکان بیسترا، بەرەو باغی پرتەقاڵ وەڕێ کەوت تاکوو بزانێ لەوێ چ باسە.

دۆن ئیگناچیۆ دیئالفارۆی دوئێناس مارکیزی دووەم خەلکی کاسێلدۆئێرۆ خاوەنی داریین لە باغێ لە نێوان دوو داری پرتەقاڵ دا و لە نێو جۆلانەی خۆیدا راکشا بوو خەریکی حەسانەوەی پاشنیوەڕۆیە بوو. هەر لەم کاتە دا گوێی بۆ مۆسیقا ڕاگرتبوو. ئەو پیاوێکی غەمگین و ڕواڵەتێکی گۆشەگیرانەی هەبوو. بە هۆی کەمخوێنی ڕەنگی بە وێنەی هەڵاڵە بزرکابوو، چونکە شەوانە شەمشەمە کوێرەکان خوێنیان دەمژی. لە ماڵێ عەبایەکی بەکڵاوی گوندنشینانی لەبەر دەکردو لەسەر کڵاوە نوکدارەکەی ( تولەدوبی ) دادەنا کە لەرادەبەدەر بێ کەسی نیشان دەدا. کاتێك هاوسەرەکەی بەو جۆرەی کە خوا خولقاندبووی، دیت لێی نزیك بۆوە پرسی:

" ئەوە چ جۆرە مۆسیقایەکە؟"

" نازانم! ئەرێ ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟"

مارکیز نەیدەزانی. لە پرسیارەکەی ڕا دیار بوو ئانارامە. بە پێچەوانە هاوسەرەکەی کە ڕەنگە بەهۆی هێنانەوەی زەرداو هاتبۆوە سەرخۆی، بەبێ لاتاو وەڵامی دایەوە. کاتێك لەگەڵ هەڵچوونە یەك بەدوای یەکەکانی هاوسەرەکەی بەرەوڕوو بوو، بە سەر سوڕماوییەوە لەسەر جۆلانەی خۆی ڕاست بۆوە هاواری کرد:

" خوایە گیان، ئەمڕۆ چ باسە!"

ماڵیان دیواربەدیواری لادیڤینا پاستۆرا شێتخانەی ژنانەوە بوو. ژنانی شێتخانە کە بەهۆی زرم‌وکوتی مۆسیقاو یاریی ئاگر ئاڵۆز ببوون، لەسەر بالکۆنی زاڵ بەسەر باغی پرتەقاڵ دەرکەوتن و بە چەپڵەلێدان پێشوازییان لە هەر تریقەیەك دەکرد. حەوتی دیسامبر ڕۆژی پیرۆزی

ئۆسقۆف ئامبێرۆزیۆس بوو و مۆسیقاو تەقوتۆق سەبارەت بە سییەرڤا ماریا لە نێـو حەوشـی کۆیلەکان بەڕێوە دەچوو. مارکیز بە دەستی بە نێوچاوانی خۆیدا داو گوتی:

" ئاسایە. سییەرڤا ماریا دەبێتە چەند ساڵ؟"

بێرناردا وەڵامی دایەوە:" دوازدە ساڵە."

مارکیز کە دیسان دەچۆوە دە جۆلانەی خۆی گوتی:" ئێستا دوازدە ساڵە؟ ژیانێکی چـەندە لەسەرەخۆ!"

ئەو خانووە کە تا سەرەتاکانی سەدە بۆ شاری نیشانەی فەخرو ڕێز بوو، ئێـستا تێکڕمـاوو غەمگین بوو. وا دەهاتە بەرچاو کە کەلوپەلی ماڵێ بە مەبەستی گواسـتنەوە لێرەولـەوێ بـڵاو بوون. عـەرزی مەڕمـەڕیی هۆڵـەکان کـە بـە شـێوەی شـەترەنج چنرابوون کـەس خـۆی تـێ نەدەگەیاندنو تانو پۆی جاڵجاڵۆکە هێندێك لە گیرەو چلچرایەکانیان داپۆشیبوو. ئەو ژوورانەی کە دیواری ئەستووریان هەبوونو ساڵانێکی زۆر کەسیان تێدا نـەژیابوو، هێـشتا بۆیـە دەبـوون ژیانیان تێدا بکرێ. هەوا بە تایبەتی لە مانگی دیسامبردا سارد ببوو و تـەزووی زسـتانێ بـە ویزەویز بە درزو کەلەبـەران دا دەخزیـە ژوورێ. کـۆنی، ڕزیـوی، خۆتێنەگەیانـدن بـە هـەموو شتێکەوە دیار بوو. تەنیا شتێك کە هێشتا شوێنەواری دەسەڵاتو کۆنترۆڵی مارکیزی یەکەمی پێوە مابوو بریتی بوو لە پێنج سەگی ڕاوێ کە شەوانە کێشکیان دەگرت.

حەوشی ژوورەوەو پڕ لە هەراهوریای کۆیلەکان، ئەو جێیەی کەجێژنی لەدایکبوونی سییەرڤا ماریای لێ بوو، لە سەردەمی مارکیزی یەکەمدا وەکوو شارێك لە نێو شارێکی دیکـەدا بـوو. ئەم حەوشەیە تا ئەوکاتەی ئاڵوویێری ئاڵۆزی کۆیلەو ئارد لە گۆڕێ دابوو، لە قەباڵـەی مـارکیز دابوو و بێرناردا لە کارگـەی شـەکری ماهاتێـسەوە کاروبـاری ماڵێـشی بـە لێزانیـەوە هـەڵ دەسووڕاند. ئێستا ئیدی ئەو هەمووە مەزنیو شکۆیە تـەنیا بەشـێکن لـە ڕابـردوو. بێرنـاردا پشتی لە ژێر باری تاقەتپڕووکێنی ژیان دا چەمی بوو و حەوشـی ژوورەوە بریتـی بـوو لـە دوو کۆختی بەدارانو داپۆشراو بە دارخورماو بڕایەوە. ئەو شوێنە دوایین پاشماوەی گەورەی ئەو ماڵە بوو کە خەریك بوو دەفەوتا.

دومینگا دو ئادڤینتۆ ڕەشپێستێکی پیاوچاك کە بە مستە ئاسـنینەکانی هـەتا شـەوگاری مەرگی ئەم ماڵە دەسەڵاتی بەسەردا هەبوو، پێوەندیی نێوان ئەم دوو جیهانـە بـوو. بـەژنێکی بەرزو ڕەقەڵەی هەبوو، خاوەنی شـعوورو زیرەکییـەکی بـاش بـووو سـییەرڤا ماریـای گـەورە کردبوو. دومینگا دو ئادڤینتۆ بێ ئەوەی دەستی لە باوەڕی یورووبایی خۆی هـەڵگرتبێ، ڕووی

کردبووە مەزهەبی کاسولیك و بە یەك رادە کەلکی لە دوو فەرهەنگ ، و لەهەرکامیان بە رادەی زیرو بەمی هەستەکانی خۆی وەردەگرت. ئەو دەیگوت دەبێ رووحی ئێوە سلامەت و پڕ بێ لە ئاشتیو، فەرهەنگێك دەبێ کەموکورییەکانی لە فەرهەنگێکی دیکەدا بدۆزێتەوە. تاقە کەس بوو دەیتوانی لە نێوان مارکیزو ژنەکەیدا بەرپوانێ بکا. هەردووکیان قبووڵیان بوو. ئەگەر دیتبای کۆیلەکان کاری دزێو و سەربەسەرەی دەکەن، یان عەیب نەبێ لە ژووریدا بەخۆیانەوە خەریك دەبن بە گەسکان مشووری دەخواردن. لەو وەختەیرا کە ئادڤینتۆ مرد، کۆیلەکان لە کاتی نێوەرۆیەدا لە کۆختە دارینەکانیان دەردەپەڕینو لە گۆشەیەك لەسەر عەرزی رۆدەنیشتن. ئەوانی دیکەش بنی مەنجەڵە برینجەکانیان دەکڕاند یان لە فێنکایی داڵانەکاندا یاریی ماکووکوو و ترابیلایان دەکرد. لەو دنیا خەمۆکەدا کەس ئازاد نەبوو، سییەرڤا ماریا ئازاد بوو، هەر بەتەنێ ئەو و هەر لەو شوێنەش. هەر بۆیەش لەو شوێنە، لە خانووی ئەسڵیی خۆیانو لە بنەماڵەی خۆی ئەم جێژنەیان بۆ گرت.

لە گرمەو زرمەی مۆسیقادا قەت بیری سەمایەکی ئارمت بە مێشکدا نەدەهات وەکی ئەوەی لە بێدەنگیدا تامی هەیە. لەوێ لە ماڵەکانی دیکەرا ژنو مێردی دیکە هاتبوونو هەموو توانای خۆیان بەکار دێنا بۆ ئەوەی جێژنەکەی گەرمتر بکەن. کچۆڵە، راست بەو جۆرەی کە بوو، خۆی نیشان دەدا. ئەو بە شێوەیەکی زۆر جوان زیاتر لە ئەفریقاییەکی زگماك لەشو لاری با دەدا، بەدەنگێکی جیا لە دەنگی خۆیو بە زمانی جۆراوجۆری ئەفریقایی گۆرانیی دەگوت، دەنگی تێکەڵ بە ئاوازی باڵندەکانو پەلەوەرەکانی دیکە دەکرد، بەجۆرێك کە گوێگری زیاتر تامەزرۆ دەکرد. بە فەرمانی دومینیگا دو ئادڤینتۆ ئەو کۆیلانەی گەنجتر بوون سووتماکیان لە دەموچاوی سییەرڤا ماریا هەڵسوو، ملوانکەی سانتەریایان لەسەر میداڵیای غوسڵی تەعمیدەکەی هەڵاوەسیو ئەو پرچەیان بۆشورد کە قەت بۆیان کورت نەکردبۆوەو لە کاتی رۆیشتندا بەر چاوی دەگرت، بێ ئەوەی رۆژانە بۆی بهۆننەوە.

کچۆڵە لە نوختەی پێگەیشتنی هێزە جۆراوجۆرەکاندا هەڵی دا. لە دایکیەوە هیچی پێ نەگەیشتبوو، بەڵام لە باوکیەوە لەشێکی داهێزراو، شەرمێونییەکی چارەسەر نەبوو، پێستێکی زەرد، چاوی شینی دە تۆخو بریسکانەوەی چەشنی مسێکی دەگمەنی پێچی زولفی بە میرات بۆ مابۆوە. چون بە پارێزەوە رەفتاری دەکرد، وا دەهاتە بەرچاو کە مرۆڤێکی نەبینراو ( نا مرئی ) ە. دایکی لە ترسی ئەو تایبەتمەندییە سەیروسەمەرەیەی کچەکەی، زەنگوڵەیەکی بە جمگەی دەستیەوە بەست تاکوو لە بەرهەیوانی ماڵێ لێی ون نەبێ.

دوو رۆژ دوای جێژنەکە، کارەکەر بە هەڵە بۆ بێرناردای باس کرد کە سەگ سییەرڤا ماریای گەستوە.

بێرناردا لە کاتێکدا کە خەریك بوو کۆتایی بە شەشەمین جار حەمام بە سابوونی بۆنداردێنا، ئەو مەسەلەیەی وەبیر هاتەوە. کاتێك پاش حەمامێ چۆوە ژووری خەوتنی خۆی مەسەلەکەی لەبیر چووبۆوە. هەر ئەو شەوە دیسان بە وەڕینی لەخۆڕاو پەیتاپەیتای سەگی کێشکچیان وەبیری هاتەوە، چونکە دەترسا سەگەکان هار بووبن. بە چرای دەستییەوە بەرەوژوورەکەی ئەوبەری حەوشەی وەڕێ کەوت و سییەرڤا ماریای لەوێ دیتەوە کە لەسەر نوێنی هیندییە سوورەکان کە لە دومینیگا دو ئادڤینتۆ بە میرات بۆی مابۆ، خەوتبوو. لەبەر ئەوەی کارەکەرەکە لە بارەی شوێنی برینەکەوە هیچی بە بێرناردا نەگوتبوو، بەرگی سییەرڤا ماریای هەڵکێشاو تەواوی ئازای لەشیی پشکنی. بە تیشکی چرایەکەی زولفە جوانەکەی کە وەك ئالقەیەك دەلەشیەوە پێچرابوو پشکنی. سەرەنجام جێ برینەکەی دۆزیەوە.

رووشاڵێك لەسەر گوێزینگی لاقی چەپی بوو، لەگەڵ خەتێك لە خوێنی وشك چەند رووشاڵێکی سەرتوێژی دیکە لەسەر پانیەی کە بە زەحمەت دەدیتران.

نیشانەکانی هاری لەم شارەدا نە دەگمەن بوون و نە بێ مەترسییش. پێش هەموو کەس باڵندە فرۆشێك بوو، سەرنجی هەموانی بۆلای خۆی راکێشابوو. ئەو لەگەڵ مەیموونێکی دەستەمۆکراو کە لە رووی ئەدەبەوە هیچی لە خەڵکی دیکە کەمتر نەبوو، رووی دە گوندەکان کرد. مەیموون لە کاتی ئابلۆقەی دەریایی ئینگلیسدا هار بوو. دەموچاوی خاوەنەکەی گەست وەکێوەکانی دەروبەر کەوت. فرۆشیاری چارەڕەشی بازاڕ بەهۆی هەڵەیەکی ترسناك بە کوتەکان زۆری تێ هەڵدرا. چەندینساڵیش دواتر دایکەکان بۆ ترساندنی منداڵەکانیان لەم بارییەوە شێعریان دانابوو. هێشتا دوو حەوتووی نەبرد مەیموونی گۆڕین بە رۆژی رووناك لە جەنگەڵەوە پەیدا بۆوە. خەڵك لە کۆخی بەرازو مریشکاندا دەستیان کرد بە پێشگیری، بە چاوی پڕ لە فرمێسك و لە کاتێکدا نزای ئایینییان بۆ فەوتانی فەرماندەی عەسکەریی ئینگلیس دەگوت و خوێنیان لە دەمی دەهات و پشوویان سوار ببوو، بۆ بەشداری لە رێورەسم، چوونە کلێسای گەورە. بەڵام ترسناکترین چیرۆکی تراژیدی لە مێژوودا تۆمار نەکرا، بەلکوو لە نێو رەشپێستەکاندا دەفن کرا، لەو جێیەی کە خەڵکەکەی قوربانییەکی هارییان شاردەوە تاکوو لە شوێنی نیشتەجێی کۆیلەڕاکردووەکان بە سێحرو جادووی ئەفریقایی دەرمانی بکەن.

سەرەڕای نموونەی ترسناك، نە سپی پێستەکان، نە ڕەشپێستەکانو نە هیندییە سوورەکان نیگەرانی بڵاوبوونەوەو پەرەگرتنی نەخۆشیی هاریو نەخۆشییەکانی دیکە لە قۆناغی شاردنەوە دا نەبوون، هەتاکوو بە ڕێکەوت یەکەم شوێنەواری قەرەبوونەکراوی دەرکەوت. بێرنارداش هەر بەم شێوەیە دەستی پێکرد، ئەو پێی وابوو چیرۆکی سەیرو سەمەرەی ڕەشەکان خێراترو بەربڵاوتر لە نێو مەسیحییەکان بڵاو دەبێتەوە، تەنانەت گەستنێکی سووکیش نەیدەتوانی زەبر لە حورمەتی بنەماڵەی کەسێك بدا، ئەوەندەی متمانە بە ئەقڵی خۆی هەبوو کە تەنانەت بە باشی نەزانی مەسەلەکەی لەگەڵ مێردەکەشی باس بکا، ئیدی بۆخۆشی فکری لێ نەکردەوە، تاکوو ڕۆژی یەك شەممە بە تاقی تەنێ چووە بازاڕ و لەوێ کەلاکی سەگێکی دیت کە خەڵکی بە داری بادامێیان هەڵاوەسیوە تاکوو نیشانی بدەن کە بە نەخۆشیی هاری تۆپیوە. سووکە ئاوڕێك بەس بۆ ئەوەی ئەو هێڵە ڕاستو چەپە سپیەی بە نێوچاوانو پێستی ڕەنگ زروکەڵیی ناژەڵەکەوە بووکە سییەرڤا ماریای گەستبوو، بناسێتەوە. وەختێك ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، بێرناردا خەفەتی بە دڵیدا نەهات. بۆ بێڵێ غەمێ بخوا : برینەو چاك بۆتەوەو رووشانەکەشی خۆ هەر شوێنی نەمابۆوە.

مانگی دیسامبر خراپی دەست پێ کرد، زۆری نەبرد ئێواران ئاسمان تارماییە ئەرغەوانییەکەی بەخۆیەوە گرتەوەو شەوانە با گەمە شێتانەو بەردەوامەکەی خۆی دەست پێ کردەوە. کریسمەس سەبارەتو بەو هەواڵە خۆشانەی لە ئیسپانیاوە دەگەیشتن، خۆشتر لە ساڵانی پێشێ بوو. خاوەن کانگاو ملکدارەکانی ئەو وڵاتە وایان پێ باش بوو کە هێزی کار وەك کاڵایەکی قاچاغی هەرزان لە هیندی ڕۆژئاوای ئینگلیس بکڕن. کەوابوو دوو شار هەبوون، شارێك بۆ ماوەی شەش مانگان شادو زیندوو بووو گەشتییە چارۆکەدارەکان لە لێوارەکانی رادەگیران، و شارێکیش کە پاشماوەی ساڵی بە خەواڵوویییەوە لە چاوەڕوانیی کەشتییەکاندا بەسەر دەبرد.

هەتا سەرەتاکانی ژانویە لە بارەی مەرگ بە هۆی هارییەوە هیچ نەبیسرا. لەو سەروبەندە دا ژنێکی سوورپێست بە ناوی ساگونتا کە هەر لە دەوروبەری وێ دەخولایەوە لە سەعاتی پیرۆزی حەسانەوەی پاشنیوەڕۆیەدا لە زەنگی دەرگای ماڵە مارکیزی دا. ساگونتا ئەو ژنە بە ساڵداچووە لە ژێر هەتاوی گەرمداو بە پێخواسیو بە گۆچانی دەسیەوە بە ڕێیەدا دەڕۆیشت، مەلافەیەکی سپی سەرتاپێ بەخواری داپۆشیبوو. لەنێو خەڵکیدا بەدناو بوو، خەڵك بەوەیان دەناسی کە پەردەی کچێنیی کچان دەدروێتەوەو منداڵی لەبەر دەبردن، لەلایەکی دیکەشەوە

سەبارەت بەو کارە باشانەی کە دەیکردن، وەك بەکارهێنانی جادووی سوورپێستان بۆ چاککردنەوی نەخۆشە تەمابڕواکان، کارە خراپەکانی خۆی قەرەبوو دەکردنەوە.

مارکیز بە نابەدڵی بەرەوپیلی چوو، لەپێش دەرگای هاتنە ژوورێدا راوەستا. ئەو ژنێکی زۆر لەسەر هەست، بێ سەرەوبەرەو زۆربلێ بوو ئەوەندەی باسی لێهاتووییەکانی خۆی کرد کە مارکیز زانی چی دەوێ‌و ئاخیری تاقەتی نەما‌و گوتی:

" بێ پێچ‌و پەنا چت دەوێ، چ دەبێ با ببێ."

ساگونتا گوتی، هاری هەرەشە لە گیانی هەمووان دەکا، هەر ئەمن کلیلی هۆبرتووسی پیرۆزم پێیە کە پشتیوانی راوچی‌و رزگاریدەری نەخۆشانی هارییە.

مارکیز گوتی:" ئەمن هۆیەکم بۆ هەبوونی ئەو نەخۆشییە لێگرەوەیە پێ شك نایە، ئەوەی ئەمن بیزانم، نە باسی مانگ گیرانیان کردوە، نە راخوشینی ئەستێرە، تاوانی ئێمەش ئەوەندە گەورە نیە کە خوا بیەوێ تووشی ئەو بەڵایانەمان بکا."

ساگونتا سەری قسانی کردەوە کە لە مانگی مارسدا مانگ گیرانێکی تەواو روو دەداو راپۆرتێکی درێژی لە بارەی ئەو کەسانەدا کە لە یەکەم یەکشەممەی مانگی دیسامبردا گەستراون، دا بە مارکیز. دوو کەس لەوانە ونن، رەنگە کەس‌وکاریان بەرێیان کردبن بۆ چارەسەری جادوویی، سێیەم کەس لە حەوتووی دووەمدا بە هۆی نەخۆشیی هاری مرد. چوارەم کەسیش هەبوو کە ئاژەڵێك نەی گەستبوو، بەڵام لیکی زاری سەگیی وێکەوت‌و هەر ئێستا لە نەخۆشخانەی ئاموردی دیووس لەسەرەمەرگ دایە. مەئموورەکانی حکوومەت لەم مانگەدا سەدان سەگی بەرەڵلایان دەرمانداو کردوە: هەتا حەوتوویەکی دیکە یەك سەگی زیندووش لە شەقامەکان نامێنێ.

مارکیز گوتی:" دیسان سەری لێ دەرناکەم، ئەوانە بە من چی‌و ئەویش لە کاتێکی ئەوا نالەباردا."

ساگونتا گوتی:" سەگ پێش هەموو کەس کچی تۆی گەستوە."

مارکیز بە دڵنیاییەکی تەواوەوە گوتی:" ئەگەر شتێکی وا رووی دابایە ئەمن پێش هەموو کەسم دەزانی."

ماکیز پێی وابوو کچۆلەکەی باشەو رێی تێ ناچێ شتێکی جیددی لە سییەرڤا ماریا رووی دابێ‌و ئەو لێی بێ خەبەر بێ. مارکیز وتووێژەکەی بە نیوە چڵی بەجێ هێشت تاکوو حەسانەوەی نیوەڕۆیەی تەواو بکا.

پاشنیوەڕۆیە لە حەوشەی ژوورەوە، کارەکەرەکان بە دوای سییەرڤا ماریادا گەڕان. سییەرڤا ماریا خەریك بوو یارمەتیی بەوە دەکرد کە کەروێشکێکی چووکە کەوڵ بکەن. دەموچاوی رەش کردبوو، لێچکەی سووری کۆیلەکانی لە سەری نابوو و پێخواس بوو. مارکیز لێی پرسی ، ئەوە راستە کە سەگ گەستوویەتی؟ کچە حاشای لێ کرد بەڵام هەر ئێوارەی ئەو رۆژە بێرناردا لە کن مارکیز رووداوەکە چۆن بوو، بۆ گێرابۆوە.

مارکیز بە سەر لێشێوای پرسی:

" ئەدی بۆ سییەرڤا، حاشای لێ دەکا؟"

"چونکە ئەو قەت راستییەکەی نالێ، تەنانەت بەهەڵەش."

پاشان گوتی:" کەوابێ دەبێ چارەسەر بکرێ، چونکە سەگەکە نەخۆشیی هاریی هەبووە."

بێرناردا گوتی :" بە پێچەوانە، مەسەلەکە ئەوەیە کە دەبێ سەگەکە بتۆپێ، چونکە سییەرڤای گەستوە، راست مانگی دیسامبرێ بوو، و ئەم گیانلەبەرە بی شەرمە هەڵ دەداو پێ دەگا."

هەردووکیان پێچەوانەی حەزی دەروونیی خۆیان، جارێکی دیکە راست وەك ئەو کاتانەی کە رقیان کەمتر لە یەکتری بوو، بە وشیاریو پێکەوە باسیان لە پەرەگرتنی دەنگۆ لە بارەی خێرایی بڵاوبوونەی هاری کرد. مەسەلەکە بۆ مارکیز روون بوو. ئەو هەمیشە دەیگوت کچۆڵەکەی خۆش دەوێ، بەڵام ترس لە هارێ ناچاری کرد دان بەوە دابنێ کەبۆ خۆدزینەوە لە گیروگرفت کڵاوی لەسەری خۆی ناوە. لە بەرامبەردا، لە سەرەتادا ئەو پرسیارانە بۆ بێرناردا نەهاتبوونە پێش، چونکە بە تەواوی ئاگای لە مەوزووعەکە هەبوو و دەیزانی کچۆڵەکەی خۆش ناوێو کچۆڵەش نەدەبووایە ئەویی خۆش ویستبا، و هەردوو حاڵەتیش بۆ بێرناردا مەنتیقی بوون. بەشی زۆری ئەو رقەی ئەو دووانە لە کچۆڵەکەیان بوو بۆ ئەو هەستەی وان دەگەڕایەوە کە کچۆڵە چ شتێکی لەوەو چ شتێکی لەوی دیکەیانەوەیە. بەو حاڵەش بێرناردا ئامادە بوو تەنیا دەست بکا بە گریانێو رواڵەتێکی داکێکی غەمناك بە خۆیەوە بگرێ، تاکوو پارێزەری حەیای کچۆڵە بێولە هەلومەرجی حەسساس دا بتوانێ بڵێ مەرگی کچەکەی هۆیەکی بەجێی هەبووە.

بێرناردا بە ئاشکرا گوتی:" هەر نەخۆشییەکی هەبێ جگە لە نەخۆشیی هاری گرنگ نیە."

لەم کاتەدا هەر وەك بڵێی بروسکەیك لە ئاسمانەوە وەمارکیزی کەوتبێ و زانی کە مانای ژیانی بەستراوەتەوە بە چی، بە پێداگرییەوە گوتی:" منداڵەکە نامرێ، ئەگەر بشمرێ، بە ویستی خوایە."

رۆژی سێ شەممە مارکیز بەرەو نەخۆشخانەی ئامۆردی دیویس لەسەر بەرزایی کێـوی لازارۆ وەرێ کەوت تاکوو ئەوەی نەخۆشیی هاریی تووش ببوو و ساگونتا بۆی باس کردبـوو، ببینـێ. ئەو نەیدەزانی کالیسکەکەی کە بە قوماشی رەش داپۆشراوە وەك نیشانەیەکی دیکە لە نەبوونی چارەسەری سەیری دەکرێ. لەمێژ سـاڵ بـوو مـارکیز تـەنیا لەبـەرهۆی گـرنگ مـاڵی بـەجێ دەهێشت، و لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا پەیتا پەیتا رووداوی ناخۆشی بۆ دەهاتنـە پـێش. شار لە کاڵبوونەوەیەکی سەدان ساڵ لەوە پێشەوەدا نـوقم ببـوو، بـەڵام خـەڵك، لێـرەو لـەوێ، روخساری تێك چـرژاوو چـاوە زەقـەکانی پیـاوێکی بـەگومانیان لـە بـەرگی تازیـە لـە سـەر کالیسکەیەك دەدیت کە لە دیواری شار رەت دەبووو بە باریکە رێیەکدا بەرەو کێوی سان لازارۆ دەچێ. لە نەخۆشخانە ئەو گولانەی لەسەر عەرزی خشتچن راکشابوون، کاتێ بە هاتنـە ژووری ئەویان زانی بە ملکەچی هاتنە سەر رێیو سواڵیان لێ کرد. لە بەشی نەخۆشانی سـەرەمەرگ، بە زنجیرێك نەخۆشێکی هارییان لە نەردەی بەستبۆوە.

ئەو دوورەگەیەکی بەتەمەنو سەرورپیشێکی رەنگ لۆکـەیی هـەبوو. نیـوەی لەشـی لـەکار کەوتبوو بەڵام هاری نیوەکەی دیکەی وەها لە وزە پڕ کردبوو کە دەبـووا بیبەسـتبایەوە تـاکوو ئەوەك خۆی بە دارو بەرد دا بدابایەو گیانی لەدەست بدا. بەوەی بۆ مارکیزیان باس کرد شـكو گومانی نەما کە ئەویش هەر ئەو سەگە رەنـگ دووکەڵییـە کـە هێڵێکـی راسـتو پـەپ بـە نێوچاوانیەوەیە وەکی سییەرڤا ماریای گەستوەو لیکە کەفاوییەکەی لمۆزی لە لەشی هەڵسووە، دیارە نەك لە پێستی ساغ بەڵکوو لەسەر رووشاڵێکی برین کە لەسەر گوێزینگی بووە.

ئەم روانینە وردە لە وەزعی نەخۆشەکە ئۆقرەی لە مارکیز هەڵگرت. ئـەو کـە بـە دیتنـی دیمەنی نەخۆشی سەرەمەرگ زەندەقی چووبوو، بێ ئەوەی تۆزقاڵێـك هیـوای بـە چـاکبوونەوەی سییەرڤا ماریا هەبێ نەخۆشخانەی بەجێ هێشت.

لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ شار لە سەرەولێژیی کێو تووشی پیاوێکی کەتـە بـوو کـە لەسـەر بەردێکی لە پەنا ئەسپە تۆپیوەکەی دانیشتبوو مارکیز کالیسکەکەی راگرت. کاتێـك پیاوەکـە قیت بۆوە، ئابرێ ئۆنچیکۆ دێسێ پەریرا کائۆ، بـەکالۆریۆسو بـەناوبانگترینو بـێ هاوتـاترین پزیشکی شاری ناسیەوە.

پیاوێکی چەشنی شای خاچ، کڵاوێکی گەڕگـەڕیی پـانی هـەتاویی لەسـە بـوو، چـەکمەی ئەسپسواریی لە پێ دا بوو، باڵتۆیەکی رەشی کاری ئازادی بە کۆڵێ وەبوو. ئەو بە تەشـریفاتی

باو هێندێك خورمەتی بۆ مارکیز نیشان دا. گوتی:" گەورەیی شایانی ئەو کەسەیە کە بە ناوی حەقیقەتەوە بجوولێتەوە."

ئەسپەکەی لە کاتی گەڕانەوەدا نەیتوانی سەربەرەوژێر وێرغەی بکا، بۆیە دڵی تۆقی. ئیپتۆنۆ کالیسکەوانی مارکیز هەولێدا زینی ئەسپەکەی هەڵگرێ. خاوەنی ئەسپەکە نەیهێشت و گوتی:

" کاتێك ئەسپێکم نەبێ زینم بۆ چیە. با هەردووکیان پێکەوە بڕزێن."

کالیسکەوان دەبووا لە کاتی سواربوونی ئابرێ نۆنچیکۆی چوارشانەدا یارمەتیی بدا و مارکیز بەڕێزەوە لەلای راستی خۆی دابنێ. ئابرێ نۆنچیکۆ لە فکری ئەسپەکەی دا بوو.

هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:" دەڵێی لەتێك لە گیانم مردوە!"

مارکیز گوتی:" هیچ شتێکی ناتوانی وەك مەرگی ئەسپێك بە ئاسانی چارەسەر بکەی."

ئابرێ نۆنچیکۆ هاتەوە سەرخۆی و گوتی:" بەڵام ئەم ئەسپە شتێکی دیکە بوو. ئەگەر بۆم کرابایە لە زەوییەکی سەرسەوز و بژوێندا دەم ناشت."

سەیرێکی مارکیزی کرد تاکوو بزانێ چ کاردانەوەیەکی دەبێ. ئینجا گوتی:

" لە مانگی ئۆکتۆبر دا ببووە سەد ساڵ."

مارکیز گوتی:" هیچ ئەسپێك ئەوندە ناژێ."

پزیشکەکە گوتی:" ئامادەم بیسەلمێنم."

ئابرێ نۆنچیکۆ سێشەممانە لە نەخۆشخانەی ئاموردی دیوس خەریکی کارێ دەبوو سەری لەو گولانە دەدا کە نەخۆشیی دیکەشیان هەبوو. ئەو خوێندکاری یەکەم و یەکێك لە دەرچووانی خوان موندێس نیەتۆی بە ئەسڵ جوولەکەی پورتوگالی بوو بۆ ئەوەی خۆی لەدەست ئیسپانییەکان وەشێرێ کۆچی کردبوو بۆ کارائیب. ئابرێ نۆنچیکۆ ناوی خراپی پێشگۆ و مورتەدی لەوی ڕا بە میرات بۆ مابۆوە، بەڵام کەس شك و گومانی لە شارەزایی ویدا نەبوو. جیاوازیی بۆچوونەکانی لەگەڵ پزیشکەکانی دیکە کە نە باوەڕیان بە توانا سەرسوڕهێنەرەکانی دەکرد و نە لە شێوە نائاساییەکانی دەبووردن، لەبڕان نەهاتوو خوێناوی بوو. ئەو حەبێکی داهێنابوو کە بە خواردنی ساڵێ دەنکێکی، ساغیی ماسولکەکانی دەستەبەر دەکرد و ژیان درێژتر دەبۆوە. بەڵام لە سێ ڕۆژی یەکەمی پاش خواردنەکەی دا وەها هەست و هۆشی دەشێواند کە جگە لە خۆی کەسی دیکە نەیدەوێرا بیخوا.

لەچەندین ساڵ پێشترەوە بۆ ئارامیی نەخۆشەکان، مۆسیقایەکی لەکن نەخۆشەکان بە چەنگ لێ دەدا کە هەر بۆ ئەم مەبەستەشی ساز کردبوو. ئەو هەمیشە نەشتەرگەریی بە کارێکی نزم دەزانی کە بۆ ماموستایانو ئارایشگەرە پیاوەکانی بە گونجاو دەزانیو بۆخۆی دەستی بۆ نەدەبرد.
شارەزاییەکی ترسهێنەری هەبوو کە بریتی بوو لەوەی کە رۆژی مردنی نەخۆشەکانی پێشتر دەزانی. ناوی چاکو خراپی ئەو هەر لەمەوە سەرچاوەی گرتبوو: خەڵك پێیان وابوو کە ئەو مردوویەکی زیندوو کردۆتەوەو کەسیش ئەو قسەیەی ردت نەدەکردەوە.
سەرەڕای ئەو هەمووە ئەزموونە، ئابرێ نۆنچیکۆ لەبەرامبەر ئەوانەدا کەنەخۆشیی هارییان تووش دەبوو تێك دەچوو، ئەو دەیگوت:" لەشی مرۆڤ بۆ ئەوەی چەندین ساڵ بتوانێ بژی، دروست نەکراوە." مارکیز تەنانەت وشەیەکی لە وتە ردنگینو وردو قورسەکانی نەچووە دەگۆێیو کاتێك دەستی بە قسان کرد کە ئیدی پزیشك قسەیەکی بۆگوتن نەمابوو.
مارکیز پرسی:" ئەو پیاوە چارەڕەشە چی لەگەڵ دەکرێ؟"
ئابرێ نۆنچیکۆ وەلامی دایەوە:" دەبێ بیکوژن؟"
مارکیز زۆر بە ترسەوە سەیرێکی کرد.
" ئەگەر مەسیحییەکی باش دەبووین، هەرچۆنێك بووایە کارێکی وامان دەکرد." پزیشك بەبێ هەڵە درێژەی دا:" پێت سەیر نەبێ کاکی بەڕێز، زۆر لەوی زیاتر کە مرۆڤ بیری لیدەکاتەوە مەسیحیی باش هەڵدەکەون."
مەبەستی وی راست ئەو مەسیحییە هەژارە رەنگ جیاوازانە بوو کە لە قەراغ شارو گوندەکان ئەم ئازایەتییەیان هەبوو کە ژەهریان دە خواردنی ئەو نەخۆشانە دەکرد کە تووشی هاری هاتوونو لە دەست داهاتووی ترسناکیان نەجاتیان دەدان. لە کۆتاییەکانی سەدەی رابردوودا ئەندامانی بنەماڵەیەك هەموویان سوپی ژەهراوییان خواردەوە چونکە هیچ کامیان دڵیان نەدەهات منداڵێکی پێنج ساڵانە بە تەنیا دەرمانخوارد بکەن.
ئابرێ نۆنچیکۆ بەم رستەیە قسەکەی تەواو کرد" خەڵك پێیان وایە ئێمە پزیشکان نازانین ئەم شتانە روویان داوە. بەڵام وا نیە، ئێمە تەنیا بۆ پاراستنیان پێویستیمان بە پرەنسیپی ئەخلاقی هەیە، جگە لەمە لەگەڵ ئەو کەسانەی لەسەرەمەرگ دان ئەوکارەی دەکەین کە ئێستا دیتت. ئێمە ئەوانە بە هویێرتووسی پیرۆز دەناسێنین. ئەوانە لە تەختەی دەبەستین کە لەسەر تەختەی ململانییەکی ترسناکترو درێژتر لەگەل مەرگدا بکەن."
مارکیز پرسی:" رێگەیەکی دیکە نیە؟"

پزیشك وەڵامی دایەوە:" پاش یەکەم بڵاوبوونەوەی هاری وەسیلەکی دیکە نیە."

پاشان باسی نامە زانستییەکانی پزیشکی کرد کە هاری بە پێی نوسخە جۆراوجۆرەکان:"گیایەکی باغچەی، سنەوبەرێك، گیایەکی بۆنخۆش، جیوە، غونچەی ئاناگالیس وەك نەخۆشی لەچارەهاتوو پلە بەندی دەکەن. کەس سەری لێ دەرناکا. کێشەکە ئەوەیە کە هێندێك هارییان تووش دەبێ‌و هێندێك نابن، بەڵام زۆر ئاسانە بڵێی ئەم دەرمانانە پێشی پێ دەگرن." ئەو چاوی دە چاوەکانی مارکیز بڕی تاکوو لە وەخەبەر هاتنی دڵنیا بێ‌و پاشان پرسی:

" بۆچی ئەو بابەتەت ئاوا بۆ گرنگە؟"

مارکیز بە درۆ گوتی :" سەبارەت بە هاودڵی."

ئەو نزیکەی سەعات چواری پاشنیوەڕۆیە بە شەکەتی لە پەنجەرەوە سەیرێکی دەریای ئارامی کردو بەدڵێکی توندەوە قبوولی کرد کە پەڕەسێلکەکان هاتوونەوە. هێشتا شنەی نەدەهات. تاقمێك لە منداڵان هەولیان دەدا کەڵکێك کە لە زۆنگاوی قەراغێ رێی لێ ون ببوو بە بەردان بکوژن‌ومارکیز چاوی لە هەڵفڕین‌و راکردنی بوو کە چۆن لەنێوان قوتکە رووناکەکانی بورجەکانی شاردا ون بوو.

کالیسکەکە لە دەروازەی شاری مەدیۆلوونا لە گەرەکێکی ئابلۆقەدراو تێپەڕی‌و ئابرێ نۆنچیکۆ کالیسکەوانەکەی لە گەرەکی قەرەباڵغی پیشەسازان هەتا ماڵەکەی رێنوێنی کرد کە دیارە کارێکی ئاسان نەبوو. نیپتۆنۆ حەفتا ساڵ بەرەو ژوور بووو بە پارێزو نزیك بین بوو. هەمیشە پێی وابوو کە ئەسپ بە تەنیا باشتر لە خاوەنەکەی جادەکان شارەزایە. سەرەنجام کاتێك ماڵەکەیان دیتەوە ئابرێ نۆنچیکۆ لە پێش دەرگایە بە قسەیەکی حەکیمانەی هۆراتس ماڵاوایی کرد.

مارکیز داوای لێبووردنی کردو گوتی:"ئەمن لاتینی نازام."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" پێویستیش نیە بزانی!" دیارە ئەم قسەیەشی هەر بە لاتینی کرد. مارکیز وەهای کار تێکرابوو کە نەی دەویست بچێتەوە ماڵێ، چونکە ئەمە یەکەمین‌و سەیرترین وتووێژی ژیانی بوو. فەرمانی بە نوپتینۆ کرد کە ئەسپە منداربووەکەی بەرێتە سان لازارو لە زەمینێکی سەرسەوزدا بە خاکی بسپێرێ‌و بەیانیی رۆژی دواتر باشترین ئەسپی تەویلەی بۆ ئابرێ نۆنچیکۆ بنێرێ.

بێرناردا پاش ئەو ئارامییە کاتیەی کە بەهۆی خواردنی دەرمانی زگچوون دەستی کەوتبوو و پاش سێ چوار جار چوونە ئاودەستی رۆژانەی کە بۆ دامرکاندنی ئاگری نێو ریخۆڵەکانی

دەیکردمالاوایی کرد تاکوو بۆ شەشەمین جار بە حەمامی ئاوی گەرمو سابوونی بۆنخۆش مێشکی ماندووی خۆی وەحەسێنێ.

لە قۆناغی سەرەتایی ژیانی هاوبەشیدا کە بە گەنجی چووە کن مێردیو لەو کاتەوە کە کەڵکەڵەی کاری وەك بازرگانانی کەوتبووە مێشکیەوەو بە سەداقەتێکی رووناکبینانەوە دەچووە پێش، زۆر تێ نەپەڕیبوو. دەکرێ بڵێین کەسێکی سەرکەوتوو بوو هەتا ئەو کاتەی لەو شەوە شوومەدا لەگەڵ یەهوودای ئەسخەر یوتی یەکتریان ناسیو نەگبەتی رووی تێکرد.

بێرناردا لە بازاڕی سالآنەی سیرکدا هەروا بە رێکەوت تووشی بوو، پیاوێك بـ ـرو بـە نیوەڕووتی، بەبێ هیچ ئامرازێکی یفاعی ململانێی لەگەڵ گایەکی شەڕانی دەرکرد. ئەو جوانچاکێك بوو لێزانیو ئازایەتییەکی هەبوو کە بێرناردا نەیدەتوانی چاوپۆشیی لێ بکا. رۆژی دواتر بێرناردا دیسان لە کەرنەڤالی کووم بیامبا دیتیەوە، لەو رۆژەشدا بێرناردا بە بەرگی سوالکەران خۆی گۆڕیو لە کەرنەڤاڵدا بەشدار بوو دەمامکی لە دەمو چاوی دا. ئەو لەلایەن ژنانی کۆیلەوە دەوری گیرابوو و ئەوانیش بە ملوانکەو بازنەو گوارەی زێڕو بەردی دە قیمەتی خۆیان وەك هاوسەری مارکیز رازاندبۆوە. لە نێو ئاڵقەی وشیارەکاندا، یەهوودا لەگەڵ کەسانێك سەمای دەکرد کە بۆ سەما پارەیان دەدا. دەبووا ریز لە نۆرە بگیرێ تاکوو تووڕەیی خوازیارانی سەما هەڵنەچێ. بێرناردا لێی پرسی:" بایی چەندە؟" یەهوودا بەدەم سەماوە وەڵامی دایەوە:" نیو رێئاڵ."

بێرناردا دەمامکەکەی لا داو پێی گوت" دەمەوێ بزانم نرخ بۆ تەمەنێك چەندە؟" یەهوودا روخساری بێدەماکی ئەوی هەڵسەنگاندو دیتی زۆریش وەك ژنە سوالکەر ناچێ بەو جۆرەی کە خۆی نیشان دەدا. ژنە هاوڕێیەکەی بەجێ هێشتو بە هەنگاوی بەرز خۆی گەیاندە بێرناردا تاکوو بزانێ نرخەکەی بقەبڵێنێ.

یەهوودا گوتی:" پێنجسەد پێزۆی زێڕ."

بێرناردا بە چاوی هەڵسەنگێنەرێکی پسپۆڕ سەیری کرد. چوارشانە بوو. پێستی لە چەشنی سەگاوی دەریایی بوو، سینگ پانو سمت پانو لاق درێژ بوو، دەستەکانی ناسك بوون، دیار بوو قەت زەحمەتیان نەدیتبوو. بێرناردا لێکی دایەوە:

" ئەتۆ بەژنت هەشت بستە."

" سێ قامکیش."

بێرناردا سەری ئەوی بۆلای خۆی هێنا تاکوو ددانەکانی ببینێ. بۆنی ئامونیاکی بن هەنگڵی بێرناردای گێژ کرد. ددانەکانی ساغو تەواوو رێكوپێك بوون.

بێرناردا گوتی:" خاوەنەکەت دەبێ شێت بێ ئەگەر بڵێ کەسێك هەڵدەکەوێ ئەتۆ بە نرخی ئەسپێك بکرێ." ئەویش وەڵامی دایەوە :" ئەمن ئازادمو بۆخۆم خۆم دەفرۆشم." بەدەنگی تێکەڵ بە زایەڵەیەکی تایبەتەوە زیادی کرد:

" سینیۆرا."

بێرناردا گوتی :" مارکیزا."

پیاوە بە رێزەوە لە بەرامبەریدا کڕنۆشی برد. بەم کارەی خورپەی خستە دڵی بێرناردا و بە نیوەی نرخی داواکراو کڕی. بێرناردا گوتی:" پیاوێکی پەسندە."

بێرناردا لە پلەوپایەی پیاوێکی ئازاددا قبوڵی کرد و ئیزنی پێدا تا لەگەڵ گیانلەبەرەکانی سیرك بچێتە سەر شانۆ. ژوورێکی لە پەنا ژووری خۆی بۆ دیاری کرد کە بۆ گەنجانی خزمەتکار لە تەویلە دانرابوو، و لەیەکەم شەودا رووتو قوتو بێ ئەوەی دەرگای دابخا لە چاوەڕوانیی وی دا مایەوە، چونکە گومانی نەبوو بەبێ بانگکردن بۆخۆی دێ. بەوحاڵەش ناچار بوو دوو حەوتووی تەواو چاوەڕوان بێ و بەهۆی ئاگری دەروونی نەیدەتوانی بە ئاسوودەیی بخەوێ.

لەڕاستی دا کاتێك پیاوە پێی زانی بێرناردا کێیەو کاتێك هاتە ژوورێو چاوی پێی کەوت مەودای نێوان کۆیلەو خاوەنەکەی دیسان پاراست. بەڵام ئەوکات ئیدی بێرناردا دەستی لە چاوەڕوانی هەڵگرتبوو و ئالقەی پشت دەرگای داخست.

پیاوە لە پەنجەرەو هاتە ژوور. بێرناردا بە هەڵمژینی هەوای پڕ لە بۆنی ئامونیاك وەخەبەر هاتو دەنگی هەناسەی دێوێکی بیست کە لە تاریکیدا بەدوایدا دەگەڕا. پیاوە بە هەناسە بڕکێوە لە گوێی چپاند :" گاندەر، گاندەر."دوای ئەو شەوە بێرناردا ئیدی دەیزانی لە ماوەی ژیانی دا نابێ کارێکی دیکە بکا.

بێرناردا بۆی شێت ببوو. هەردووکیان شەوانە لە قەراغ شاری دەچوونە سەیری سەمای مۆمەکان. پیاوە لە بەرگی فراکداو بە کڵاوی لوولەیی کە بێرناردا بە سەلیقەی خۆی هەڵی بژاردبوو و وەك هاوسەر خۆی دەنواند. بێرناردا لەسەرەتادا لە بەرگی دیکەدا دەردەکەوتو پاشان بە روخساری واقعیی خۆی. بێرناردا وەك بارێزە دەسبێنو زنجیرو ئەنگوستیلەو گوارەی زێڕی بەسەردا باراندو ئەڵماسی بۆ ددانەکانی دانا. کاتێك بێرناردا زانی ئەو تووشی هەرکەسێك بێ هاوجێی لەگەڵ دەکا، بیری کردەوە کە مەرگ تاقە رێگایە بەڵام سەرەنجام بەوەندەی رازی بوو کە بۆی مابۆوە. ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ ئەو وەختەی دومینیگا دی ئادڤینتۆ لە کاتی پشووی پاشنیوەڕۆیەدا لەنەکاو و لە حاڵێکدا پێی وابوو ئەو لە کارگەی

پالاوتنی شەکرە، هاتە ژووری بێرناردا، بەلام بە رووتو قووتی بەسەر هەردووکیان دا هات کە خەریکی ئەو بەزمەی بوون. ژنە کۆیلە زیاتر سەری سوڕما تا ئەوەی کە بترسێ. لە حالێکدا دەستی بە دەزگیرەی دەرگاوە بوو لەجێی خۆی راوەستا.

بێرناردا بەسەری دا قیژاند:" وەك مردووان لێر رامەوەستە، یان دەخۆت هەڵدە یان ورە تێکەڵ بە."

دومینیگا دی ئادڤینتۆ رۆیشتو دەرگای لە پشتەوەرا پێوە دا، دەنگی پێوەدرانی دەرگا بۆ بێرناردا وەك شەپەلاغە وا بوو. شەوێ کچی کۆیلەکەی بانگ کردە لای خۆیو هەڕەشەی لێ کرد کە ئەگەر ئەوەی دیتوویەتی بیدرکێنێ بە توندترین شێوە تەمبێی دەکا. کچە کۆیلە وەلامی دایەو :" نیگەران مەبە، دەزانم. ئەتۆ هەرکات هەرچی بتەوێ دەتوانی لە منی مەنع بکەیو ئەمنیش لەسەر چاوی دادەنێم ."و بەم جۆرە کۆتایی بە قسەکەی هێنا:" تەنیا شتێك ئەوەیە کە ئیدی ناتوانی لە بیرکردنەوەم بێ بەش بکەی."

تەنانەت ئەگەر مارکیزیش شتێکی لەم بارەیەوە دەزانی، وای نیشان دەدا کە ئاگای لە چ نیە. لە نیهایەتدا سییەرڤا ماریا تەنیا کەسێك بوو کە بێرناردا و هاوسەرەکەی بە هاوبەشی خاوەنی بوون، و مارکیز کچەکەی لە خۆی نا، بەلکوو لە ژنەکەی دەزانی. بێرناردا تەنانەت تاقە جارێکیش فکرێکی وای بە مێشکیدا نەهاتبوو. ئەو منداڵە لە کن دایکی وا لەبیر کرابوو کە پاش مانەوەیەکی زۆر لە کارگەی پالاوتنی شەکر، لەگەڵ کچۆڵەیەکی دیکەی لێ گۆڕا، چونکە ئەو کچەش بەژنو بالای بەقەد وی بوو، بەلام وەك وی نەدەچوو. بێرناردا کچۆڵەی بانگ کردو پشکنیو لە بارەی ژیانیدا پرسیاری لێ کرد بەلام وەلامی نەبیستەوە.

بێرناردا گوتی:" ئەتۆش وەك بابت بە سەقەتی خولقاوی."

ئەوێ رۆژێ ئەو دووانە لە حاڵو وەزعێکی ناوادا بوون.کاتێك مارکیز لە نەخۆشخانەی نامور دی دیوس هاتەوەو بێرناردا بڕیاری خۆی راگەیاند کە لە مالێدا بە مستی ناسنین هەوسار لە ملی هەمووان دەکا، دژکردەوەی مارکیز ئەوەندە شێتانە بوو کە بێرناردا قسەکانی خۆی خواردنەوە.

وەك یەکەم هەنگاو، مارکیز ژووری خەوی دایەگەورەی خانەدانەکەی دایەوە بە کچەکەی. ئەوە ژوورێك بوو کە بێرناردا کچەی لەوێ دەرکردبوو بۆ ئەوەی لەلای کۆیلەکان بخەوێ. شکۆی ئەو سەردەمە لەژێر تەپوتۆزی رۆژگاردا وەك خۆی مابۆوە. بریسکانەوەیەکی کەم رەنگی

تەختی خەوی ئەشرافیی ڕەنگ برنجی دەبـووە هـۆی ئـەوی کارەکـەرەکان پێیـان وابـێ لـە زێڕییـە. پەردەیەك لە تۆڕی بووکانو سەرچەفێکی دەستچن کە دوگمـەی پێـوە دوورابـوو و ڕێشۆڵەی بـەنو کەرەسەی دیکەی جوانی، کاسەی چینیی دەسشۆری، کەلوپەلێکی زۆری ئارایش و جێگە عـەتر کـە بە نەزمێکی دایك سالارانەوە لە پەنا مێزی ئارایشدا دانرابـوون. تـەوالێتی سـەیار، بەڵغەمـدانو تەشتی ڕشانەوەی چینی، جیهانێکی خەیاڵیی لە خەونی پیرەژنی تووشبوو بە باداری بۆ ئـەو کـچەی کە قەت لە دایك نەبوو و بۆ ئەو نەوەی کچەی کە قەت نەی دیت، پێك هێنابوو.

کاتێك ژنانی کۆیلە ژووری خەویان وەك پێشوو ئـاوەدان دەکـردەوە، مـارکیز خـەریك بـوو ڕێوشوێنەکانی خۆی بەسەر ماڵێدا دەسەپاند، ئەو کۆیلانەی لـە ژێـر سـێبەری لای بـاکووری ماڵێ وێژینگیان دەدا، ڕەپێ دەدانو ئەوانەش کە خەریکی کاری تایبەتیی خۆیـان لـە گۆشـەو کەناری ماڵێ بوون یان لـە ژووره داخراوەکـان خـەریك بـوو خۆیـان بـۆ یـاری ئامـادە دەکـرد هەڕەشەی لێدانو زیندانیکرانی لێ دەکردن. هیچ کامیان هەڕەشەی نوێ نـەبوون. ئـەم شـتانە کاتێك بێرناردا سەرۆکایەتیی ماڵێی بە ئەستۆوە بوو زۆر توندتر بەڕێوە دەچـوون. دومینیگـا دی ئادڤینتۆ بۆ ئەوەی بەباشی بەڕێوە بچن هەوڵی دەداو مارکیز لەبەرچاوی هەمووان بەو قسە مێژوویەیی کە هەمیشە لەسەر زاری بوو، خۆی دەردەخست:" لە ماڵە من دا ئەو کـارە دەبـێ بکرێ کە ئەمن فەرمانی دەدەم." بەڵام کاتێك بێرناردا خۆی دە زەلکاوی لێوان لێو لە قەوزەی کاکاو هاویشت و دومینیگا دی ئادڤینتۆ مرد کۆیلەکان دیسان بە پارێزێکی تەواوو بە دزیەوە خۆیان دەژووری خزاند. لە پێشدا ژنان بە منداڵەکانیانەوە، تاکوو لـە وردەکارانـدا یارمـەتیان بدەنو پاشان بەدوای فێنکایی داڵانەکاندا دەگـەڕان، پیـاوە بێکارەکـانیش هـەر بـەم شـێوەیە دەجووڵانەوە. بێرناردا کە لە جندووکەکانی خانووە وێرانبووەکە دەترسـا، کۆیلـەکانی ڕەوانـەی شەقام کرد تاکوو خواردنی خۆیان بە سواڵ دابین بکەن. ئەو جارێك لەو جارانەی تووشی قەیرانی ڕووحی دەهات بڕیاری دا جگە لە سێ چوار کۆیلە کە بۆ کاری ماڵێ کاری پـێ بـوون، ئـەوانی دیکە ئازاد بکا بەڵام مارکیز دژایەتیی خۆی لەگەڵ ئەم بڕیارە دەربـڕی:" ئەگـەر قـەرارە ئـەم کۆیلانە لەبرسان بمرن، باشترە لێرە بمرن تاکوو جێگایەکی دیکەی جگە لێرە."

کاتێك سەگ سییەرڤا ماریای گەست، چونکە مارکیز باوەڕی بە ڕێوشوێنی ڕواڵەتی نەبوو، ئەو کۆیلانەی کە دیار بوو ڕێکوپێکترنو شایانی باوەڕپێکردن بـوون هـەڵ دەبـژاردو ئیمتیـازی خۆی پێ دەدانو بەجۆرێك ڕای دەهێنان کە ڕەفتاری تونـد لـە گـەڵیان، تەنانـەت بێرنارداشـی تووڕە دەکرد.

کاتێك ماڵێ بۆ یەکەم جار پاش مەرگی دومینیگا دی ئـادڤینتۆ دیـسان ڕێـك خرایـەوە، سـەرەتای شەوێ مارکیز سییەرڤا ماریای لە ژووری ژنانی کۆیلە، لە نێو ژمارەیەك رەشپێـستی گەنجدا کە بە شێوەیەکی نارێك لێرەولـەوێ لـە جۆلانـەی کـەوانی دا راکـشابوون، دۆزیـەوە. هەمووی وەخەبەر هێنان تاکوو رێوشوێنی نوێی ماڵێیان پێ رابگەیەنێ و پێی لەسـە ر ئـەوە داگرت کە:

" لەمڕۆوە ئەم کچۆڵەیە لە ژوورێدا دەژی. بۆ ئێوەو بۆ سەرانسەری ئیمپراتۆری دەبێ روون بێ کە ئەو بنەماڵەیەکی هەیە، بنەماڵەیەك کە هەموویان سپیپێستن."

کاتێك مارکیز دەیەویست لە باوەشی بکاو بیباتە ژوورێکی دیکـە، کـچۆڵە بەربـەرەکانێی دەکرد. کەوابوو دەبووا تێی گەیاندبا کە سیستمێکی پیاوانە بەسەر جیهانـدا زاڵـە. لـە ژووری خەوی دایەگەرەیدا کاتێك مارکیز دامێنی کەتانیی کـچەکەی دادەکەنـدو بـۆ ئـەوەی بـەرگی خەوێی لەبەربکا وشەیەکی لێ نەبیست. مارکیز لە پەنا تەختەکە دانیشتو خەریکی دوگمـەی بەرگی خەوێ کچۆڵەکەی بوو تاکوو لە کونە تازەکانی جێ دوگمـەکانیان رۆبکـا. کـچۆڵە لـە بەرامبەری راوەستابوو و بەبێ جووڵە سەیری دەکرد. بێرناردا کە لە دەرەوە ڕا سەیری دەکردن بە گاڵتە گوتی:" ئێوە بۆچی پێکـەوە ژیـانی هاوبـەش پێـك نایـەنن؟"و چـونکە مـارکیز هـیچ وەڵامێکی نەدایەوە، دیسان درێـژەی دا:" موعامەلەیـەکی خـراپ نیـە، ئەگـەر سـەر بگـرێ لەوانەیە خاتوونێکی خانەدانی کرئوولی پەنجە باڵندەییتان ببێ کە لە سیرك بێفرۆشی."

گۆڕانێکی کەمیش لە خودی بێرنارادادا بـەدی دەکـرا. سـەرەڕای پێکەنینـە شـێتانەکەی، دەموچاوی هێندێك تێکچرژابوو و لە نزمیەکەی دا نیـشانەیەك لـە نیـازی بـاش هەسـتی پـێ دەکرا، بەڵام مارکیز گرنگیی پێ نەدا. هەرکە زانی بێرناردا رۆیشتوە بـە کـچۆڵەکەی گـوت:" ئەو بەرازێکی وەحشییە."

مارکیز پێی وابوو تروسکاییەکی لە تۆگری لە کچەکەدا بەدی کردوە.، لێی پرسی:" دەزانی بەرازی وەحشی چیە؟" بـە تامەزرۆییـەوە چـاوەڕوانی وەڵام مایـەوە. سـییەرڤا ماریـا وەدوای قسەکەی نەکەوت. لە سەر تەختی خەوەکەی راکشاو سەری لەسەر باڵنجی پـەڕ دانـا. کـچۆڵە دەرفەتی پێ دا تاکوو مارکیز مەلافـەی کـەتانی کـە بـۆنی داری سـدری گرتبـوو چـۆکەکانی داپۆشێ. بێ ئەوەی لە رووی بەزەییەوە تەنانەت چاوێك لە روخـساری مـارکیز بکـا، مـارکیز هەستی بە نازاری ویژدان کرد و گوتی:

" پێش نووستنێ نزایە ناکەی؟"

کچۆڵە تەنانەت چاوێکیشی لێ نەکرد. چونکە خووی بە نوێنەوە گرتبوو چووە نێو جێ و بێ ئەوەی ماڵاوایی بکا خەوی لێ کەوت. مارکیز پەردەکەی داخست ئەوەکوو شەمشەمەکوێرەکان لە خەویدا بەسەری وەربن. تاوێك پێش سەعات دەی بوو کە لوورەی بە کۆمەڵی شێتان لە خانوویەکی بەتاڵدا کە کۆیلەکانی لێ نەبوو، تەحەممول نەدەکرا.

مارکیز سەگەکانی بەرەڵلا کرد. بەرەو ژووری خەوی دایەگەورە هورووژمیان بردو هەولێیان دا کەلەبەری دەرگای بکەنەوە. مارکیز تۆقی سەریا سەگەکانی بە قامکی لاواندووەوەو بەو هەواڵە خۆشە ئارامی کردنەوە:

" ئەمە سییەرڤایە لەمڕۆ بەیانییەوە لێرە دەژیە." ئەو شەوە مارکیز لە بەر قوولەقوولی شێتان کە هەتا دووی سەرلەبەیانی درێژەی کێشا هەم کەم نوستو هەم خراپ. لەگەڵ یەکەم بانگی کەڵەبابێ قیت بۆوە. هەوەڵ کەس بوو چووە ژووری سییەرڤای. کچۆڵە لە جیاتی ئەوەی لە ژوورەکەی بێ لە نێو ژنانی سەر بەکرێژی کۆیلەکان بوو. کۆیلەیەك کە لە پەنا دەرگای چوونە ژوور خەوتبوو، لە ترسان وەخەبەر هات. بەر لەوەی مارکیز پرسیارێکی بکا،گوتی:" ئەو بۆخۆی هات، سینیۆر. تەنانەت نەمزانی کەنگێش هاتوە. مارکیز دەیزانی کۆیلەکە راست دەکا. پرسیاری کرد:" کاتێك سەگ سییەرڤا ماریای گەست کامەتان لە وێ بوون؟" تەنیا رەشێکی دوورەگە کە ناوی کاریداد دیل کوبرێ بوو لە حاڵێکدا کە ئەوەندە ترسابوو دەلەرزی، خۆی ناساند. مارکیز ئارام بۆوە. پێی گوت:" وابزانە ئەتۆ دومینیکا دی ئادڤینتۆی، ئاگات لێی بێ." مارکیز ئەرکەکانی بۆ دەستنیشان کرد. تێی گەیاند کە تەنانەت یەك چرکەش سییەرڤا ماریای لەبەر چاوان ون نابێ، بە نرمی و لەسەرخۆ، نەك بە خۆشخزمەتی رەفتاری لەگەڵ بکا. لە هەمووی گرنگتر ئەوەکە سییەرڤا ماریا نابێ لەو تەلدڕوویەی لە نێوان حەوشی کۆیلەکان و ماڵیدا دەکێشرێ، تێ پەڕێ. بەیانیان پاش هەستان و ئێواران پێش چوونە نێو جێ کاریداد دیل کوبرێ دەبێ بێ ئەوەی کچۆڵە پێ بزانێ راپۆرتێکی تەواو بداتەوە بە مارکیز.

لە کۆتاییدا گوتی:" باش سەیرکە، چ دەکەی و چۆنی دەکەی. چونکە تاقە بەرپرسی کە وەدوای فەرمانەکانم دەکەوی."

نزیکەی سەعات حەوتی بەیانی، مارکیز پاش ئەوەی سەگەکانی بەستنەوە چووە ماڵی ئابرێ نۆنچیکۆ. پزیشك بۆخۆی دەرگای کردەوە، چونکە کۆیلەو خزمەتکارێکی نەبوو. مارکیز چونکە پێی وابوو مستەهەقی سەرکۆنەیە لە پێشدا دەستی بە سەرکۆنە کرد.

پزیشکەکە گوتی:" ئێستا کاتی چاوپێکەوتن نیە." پزیشکەکە بە ڕێزلێنانێکی زۆر سەبارەت بە ئەسپێك کە وەری گرتبوو دڵی چاك کردەوە. مارکیزی لە نێو حەوشەی ڕا تا کن وردە ئاسنی ئاسنگەرانی پێشوو برد کە ئێستا تەنیا کەلاوەیەك لە کوورەی ئاگردانەکەی لێ مابۆوە. لەسەر ڕێگا بە زمانی لاتینی دە گوێی ڕێویەکی دوو ساڵەی جوانی چپاند کە دوور لە شوێنی لەدایکبوونی ئارام دیار بوو و زللەیەکی بەحاستەمی لە ڕوومەتی دا.

مارکیز بۆ پزیشکی باس کرد کە ئەسپە مردووەکەی لە باغی سەرسەوزی پێشووی نەخۆشخانەی ئامورر دی دیوس بە خاك سپاردوە. ئەوێ لە کاتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرادا گۆڕستانی دەوڵەمەندان بووە. ئابرێ نۆنچیکۆ سەبارەت بە گرنگیدانی لە رادەبەدەری وی بەو بابەتە سوپاسی کرد.

کاتێك خەریکی قسان بوون، پزیشك هەستی بەوە کرد مارکیز لێی دوور دەکەوێتەوە. ئەو دانی بەوە دا هێنا کە قەت نەیوێراوە سواری ئەسپ بێ.

ئەو گوتی:" ئەمن ئەوەندەی لە باڵندان دەترسم ئەوەندەش لە ئەسپان دەترسم."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی " ناخۆشە لە ئەسپان نەگەی، مرۆڤایەتیی وەپاش خستوە. ئەگەر ئێمە جارێك بەم شێوەیە سەرکەوتباین، دەمان توانی بوونەوەرێکی نیوە ئەسپ ـــ نیوە مرۆڤ بخولقێنین."

رووناکایی نێو ماڵێ لە دوو پەنجەرەی روو بە دەریایەکی دوورەوە دابین دەکرا. ماڵەکە شاگردێکی عەرەبی لاو بە شێوەی خۆی وەك بەشێك لە لەشی خۆی ڕێكوپێکی کردبوو. بۆنێکی خۆش هەموو هەوای داگرتبوو کە بە رواڵەت بەهۆی کاری پزیشکیەوە بوو. مێزێکی ڕێکوپێکی نووسینو شووشەبەندێك لە دەفری چینی کە پڕ بوون لە رەگی گیاو دەستنووسە لاتینییەکان. لە گۆشەیەکی دوورو بەلاوە، چەنگێکی سێحراویی زێڕکفت دانرابوو. ئەوە هەر کتێب بوونو سەرنجیان رادەکێشا، زۆربەیان بە زمانی لاتینی بوونو بەرگی گرانیان پێوە بوو. لە چەکمەجەی شووشەییو جێ‌کتێباندا دانرابوون یان بە جوانی لەسەر عەرزی هەڵچنرابوون. رۆیشتنی پزیشك بە هەنگاوی لەسەرخۆ بە نێو کاغەزاندا جیاوازییەکی زۆریشی لەگەڵ رۆیشتنی کەرگەدەن لەسەر تەختی خەوی پەڕی قووی نەبوو. مارکیز لەو هەمووە کتێبە تاقەتی بەسەر چوو و گوتی:" هەموو زانستی دنیایە دەبێ لەم ژوورە دا خڕ کرابێتەوە."

ئابرێ نۆنچیکۆ بە وشیاریەوە وەڵامی دایەوە:" ئەم کتێبانە بەکەڵکی چ دێن، ژیانم لەسەر ئەمانە دانا تاکوو نەخۆشییەکان چارەسەر بکەمو پزیشکەکانی دیکە ناچار بکەم دەست لە دەرمانەکانیان هەڵگرن."

پیشیلەیەکی خەوتووی لەسەر قەنەفە گەورەکە هەڵگرت تاکوو مارکیز بتوانێ دابنیشێ. پێشنیاری سەوزیی کولاوی سەر چرای ئەلکۆلی بە مارکیز کردکە بۆخۆی دروستی کردبوو لەگەڵ ئەمەشدا دەستی کرد بە باسی ئەزموونە پزیشکییەکانی خۆی، تاکوو هەستی بەوە کرد تاقەتی مارکیز بەسەر چووە. مارکیز لە نەکاو قیت بۆوەو پشتی لە پزیشك کردو سەیری دەریای ئارامی کرد. سەرەنجام بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە غیرەتی وەبەرخۆی ناو بە بۆڵەبۆڵ گوتی:" بەکالۆریۆسی ئیلاهیات."

ئابرێ نۆنچیکۆ چاوەڕوانی وشەیەکی ئەوتۆ نەبوو:" ها؟"

مارکیز بە خۆشحاڵییەوە گوتی:" ئەوەی لەبارەی رازەکانی پزیشکیدا گوتت، تەنیا بە کەلکی خۆت دێن، قبووڵمە کە راستن. سەگی هار کچی منیشی گەستوە."

مارکیز چاوی دەوی بڕیو لەگەڵ رووحێکی ئاگا بەرەورووبوو.

پزیشك وەڵامی دایەوە:" دەزانم، پێم وایە هەر لەبەر ئەوەش بەم بەیانییە زوویە هاتوویە ئێرە."

مارکیز گوتی:" راستە." ئەو پرسیارەی لە نەخۆشخانە لەکن نەخۆشەکە کردبووی دووپات کردەوە:" دەبێ چ بکەم؟"

ئابرێ نۆنچیکۆ لە جیاتی وەڵامی توندی رۆژی پێشتر داوای چاوپێکەوتنی سییەرڤا ماریای کرد. مارکیزیش کە بۆخۆی داوایەکی ئەوتۆی هەبوو رازی بوو. کالیسکە لە بەر دەرگای ماڵێ لە چاوەڕوانیی ئەوان دابوو.

کاتێك گەیشتنە ماڵە مارکیزی بێرناردا لەبەرامبەر مێزی ئارایشێ دانیشتبوو پرچی شانە دەکرد، دیارە نە لەبەر کەس، بەڵکوو بە یادی نازو عیشوەی ساڵانی رابردوو کە بۆ دوایین جار یەکتریان خۆش ویستو مارکیز لە بیری خۆی سڕیبۆوە. ژوورەکە لە بۆنی خۆشی بەهاریی سابوونەکانی بێرنارادای داوەستابوو. بێرناردا هاوسەرەکەی لە ئاوێنەدا دیتو بەبێ تووڕە بوون گوتی:" پێت وایە ئێمە کێین ئەسپی بدەینە کەسێك؟" مارکیز خۆی لە وەڵامدانەوە بوارد. بەرگی ماڵێی لەسەر تەختی ئالۆزی خەوێ هەڵگرتو بە بێ کەمترین رووخۆشی بۆ بێرناردای توڕ داو ئەمری پێ کردو گوتی:" خۆت لەبەرکە، پزیشکەکە هاتوە."

بێرناردا گوتی:" پەنا بەخوا."

مارکیز:" بۆ تۆ نەهاتوە. هەرچەند ئەتۆ زاتر پێویستت بە پزیشك هەیە. ئەو لەبەر کچۆڵەکە هاتوە."

بێرناردا:" بی سوودە، ئەو یان دەمرێ یان نامرێ. خۆ شتێکی دیکە نیە." پاشان تێ فکری:" کام پزیشك؟"

مارکیز:" ئابرێ نۆنچیکۆ."

بێرناردا لە عەزاب دابوو. پێی خۆش بوو تەنیاو بەرووتی بمرێو شەرەفی خۆی بە دەستی جوولەکەیەکی بێ ناموس نەسپێرێ.

ئابرێ نۆنچیکۆ پزیشکی بنەماڵەیی دایكوبابی مارکیز بوو. سەبارەت بەوەی پزیشکێکی قسەلەڕوو بووو ئەوەی بۆی دەردەکەوت، بە زمانیش دەیگوت، لەخۆیان دوور خستبۆوە. مارکیز لەبەرامبەر بێرناردایدا راوەستاو گوتی:" تەنانەت ئەگەر ئەتۆش بە دڵت نەبێ هەر بەو جۆرەی کە بەدڵی منیش نیە، بەڵام ئەتۆ دایکیو لەبەر خاتری قانوونەکانی خوا داوات لێ دەکەم هێندەی لێ مەڵێو دەست لەو مەحکەمەیەی هەڵگرە."

بێرناردا گوتی:" ئەمن کارم پێی نیە، ئەتۆ هەرچی بیکەی دەسەڵاتت هەیە. ئەمن کارم تەواوە."

دوور لە چاوەڕوانی، کچۆڵە بەبێ کەمترین شەرم ئیزنی بە پزیشك دا تاکوو تەواوی ئازای بەدەنی بپشکنێو ئەوەندە بە وریاییەوە لە کارەکەی دەڕوانی کە دەتگوت خەریکی سەیرکردنی سەعاتێکی یارییە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" ئێمە پزیشکەکان بە دستان دەبینین." کچۆڵەکە بۆ یەکەم جار بە خۆشحاڵیەوە پێکەنی.

سەلماندنی سلامەتیی وی وەك رۆژی روون دیار بوو. سییەرڤا هەرچەند لەشێکی لاوازی هەبوو بەڵام بەژنێکی رێکوپێکی هەبوو، پەیکەری دەتگوت بە تەمێك لە زێری نامەرئی داپۆشرابوو. ئەو ئەندامە یەکەم خونچەی هەڵدانو بەختەوەریی ئەوی بەدیار دەخست. ددانەکانی سییەرڤا تەواو بوون، چاوەکانی تیژو لاقەکانی ئارام، دەستەکانی سپیو سۆڵو هەر تاڵە موویەکی زولفی ئالقەئالقەی، زایەڵەی ئاهەنگێکی دوورودرێژی ژیان بوو. سییەرڤا چاوئەترسانەو بە لەسەرخۆییەکی تەواوو بە لێزانیەوە وەڵامدەری پرسیارەکان بوو. دەبووا زۆر چاکت ئاسیبا تاکوو بزانی وەڵامەکانی دەقاودەق راستن. کاتێك پزیشکەکە برینێکی بچووکی لەسەر گوێزینگی لاقی دۆزیەوە، کچۆڵە وریاتر بۆوە. ئابرێ نۆنچیکۆ بە زیرەکیەوە پرسی:" لە جێیەك کەوتووی؟"

کچۆڵە بێ ئەوەی چاو بتروکێنێ، ئەنییدی کرد:

" لەسەر تەپلەك"

پزیشکەکە بە زمانی لاتینی قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد کە مارکیز هاتە نێو قسانەوە:

" بە ئیسپانیای بیڵێ تا تێبگەم."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" لەگەڵ تۆم نەبوو، بیر لە زمانی سەقەتی لاتین دەکەمەوە."

سییەرڤا ماریا کەیفی بە رەفتاری هونەرمەندانەی ئابرێ نۆنچیکۆ دەهات. ئەو گوێی لەسەر سینگی سییەرڤا ماریا دانا تاکوو ترپەی دڵی ببیسێ. دڵی لەبەر تەوژمی لێدان خەریك بوو بتەقێ. شەونمێکی بێ رەنگی سارد لە سەر پێستی نیشتبوو کە بە فەرقێکی کەمەوە وەك بۆنی پیوازێ دەچوو. کاتێك پشکنین تەواو بوو دوکتور زللەیەکی چووکەی لە رووومەتی سییەرڤا داو گوتی:" ئەتۆ زۆر ئازاو بەجەرگی."

کاتێك لەگەڵ مارکیز تەنیا مانەوە، پێی گوت کە کچە دەزانێ سەگەکە هاریی پێوە بووە. مارکیز تێنەگەیشتو گوتی:" ئەم کچە درۆیەکی زۆری بۆ تۆ کردن بەڵام ئەوەی دەبوو بیڵێ، نەیگوت."

پزیشکەکە گوتی:" کاکی بەڕێز، ئەو هیچی بۆ من باس نەکرد بەڵکوو دڵی بوو قسەی لەگەڵ دەکردم. دڵی وەك بۆقێکی نێو قەفەز خۆی هەڵ داویشت."

مارکیز بە غوروورێکی باوکانەوە خۆی لە ژماردنی درۆ سەیروسەمەرەکانی دیکەی کچەکەی پاراست و گوتی:" رەنگە ببێتە شاعیر." ئابرێ نۆنچیکۆ نەیدەویست قبووڵ بکا کە درۆ لە تایبەتمەندییەکانی هونەرەو گوتی:" بەرهەم هەرچەندە روونتر بێ، شێعریش بەو رادەیە واتادار دەبێ."

تەنیا شتێك کە پزیشك نەیدەویست باسی بکا، بۆنی پیوازی ئارەقەی لەشی کچەی بوو. چونکە پێوەندیی نێوان بۆن و هاری بۆوی ناڕوون بوو، ئەو خاڵەی بە گرێکوێرە دانا. پاشان کاریداد دیل کوبرێ بۆ مارکیزی ئاشکرا کرد کە سییەرڤا ماریا بە دزی فێری فێڵ و تەڵەکەی کۆیلەکان بووە. ئەوان هەتوانی بنێشتی مانایووایی یان داوەتێ بیخوا لە عەمباری پیوازێدا رایان گرتوە تاکوو سێحرو جادووی سەگەکە بەتاڵ بێ."

ئابرێ نۆنچیکۆ چاوپۆشیی لە چووکەترین نیشانەکانی هاری نەکرد و گوتی:" هەرچی جێ کەڵپەکە قووڵتر بێ و لە ئێسك نزیکتر بێ ، بەو رادەیەش یەکەم هێرشەکان دەوامیان دەبێ." پاشان باسی نەخۆشێکی کرد دوای پێنج ساڵان مرد. هەرچەند ئەو گومانە لەجێی خۆی مایەوە کە رەنگە ئەو دواتر نەخۆشیی دیکەی تووش بووبێ. ساڕێژبوونەوەی برین هیچ مانایەکی نیە. پاش ماوەیەکی نادیار رەنگە

برینەکە سەرلە نوێ تەشەنە بکاتەوە، ئەستوور بێ چلکێ بکاو قۆناغی دوایی نەخۆشییەکە بە ئێش‌و ئازار بێ‌و مردنێکی خێرای بەدواوە بێ. قانوون ڕێگە دەدا تەنیا پەنا بۆ نەخۆشخانەی ئاموردی دیوس بەرن. لەوێ سێنێگالیی دە پسپۆڕی لێ بوون کە دەیان زانی لەگەڵ مورتەدو شێتان چۆن ڕەفتار بکەن. لە غەیری ئەوەدا مارکیز دەبووا گوناحەکەی وەئەستۆ گرتباو کچۆڵەی لە تەختەی بەستباو لێی گەڕابایە هەتا دەمرێ.

لە کۆتایی دا گوتی:" ئەوەندەی ئێمە بزانین کەس گیانی لە نەخۆشیی هاری بە سلامەت دەرنەچووە."

مارکیز بە پێداگرتنەوە پێی وابوو هیچ خاچێك ئەوندە قورس نیە کە ئامادە نەبێ هەڵیگرێ. منداڵەکە دەبێ لە ماڵێ بمرێ. پزیشکەکە بە هاودەردی، بۆ تەئیدکردن سەری بە نیشانەی نا لەقاند.

ئینجا گوتی:" کاکی بەڕێز، چاوەڕوانیی کەمترین چاوپۆشیم لێ نەدەکردی. گومانم نیە رووحی تۆ ئەوەندە خۆڕاگرە کە بتوانێ دەرەقەتی ناخۆشییەکان بێی."

ئەو جارێکی دیکە پێی لەسەر ئەوە داگرتەوە کە پێشبینییەکان جێی نیگەرانی نین. برینەکە لە ناوەندی سەرەکیی مەترسی دوورەو کەس وەبیری نایە کە برینی کچەی خوێنی لێ هاتبێ. بەگوێرەی پێشبینیی وی سییەرڤا ماریا نەخۆشیی هاریی تووش نابێ.

مارکیز پرسی:" لەم ماوەیەدا؟"

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" لەم ماوەیەدا مۆسیقای لێ بدەن، ماڵی پڕکەن لە گوڵ، با باڵندەکان بخوێنن. کچۆڵەی لە کاتی رۆژئاوابووندا ببەنە قەراغ دەریایە. هەموو ئامرازەکانی خۆشیی بۆ دابین بکەن:" ئینجا قسەکانی دەحەوای کردن‌و بە ڕستەی لاتینیی هەمیشەی خۆی ماڵاوایی کرد. بەڵام ئەمجار لەبەر حورمەتی مارکیز وەریگێڕایەوە:" کاتێك بەخت شیفا نەدا، هیچ هەتوانێك چارەسەر نابێ:"

# ٢

قەت ئەوە روون نەبۆوە کە مارکیز چۆن لە دۆخێکی وادا ئەوندە بێ مشوور بێو هەر لەجێدا بۆچی سەرەڕای ئەوەی ڕێگای ڕەبەن بوونی بۆ ئاسان بوو ژیانێکی هاوبەشی ئاوا خراپی تەحەممول دەکرد. هەردەم هەرچی ویستبای لە سایەی دەسەڵاتی لەڕادەبەدەری باوکی وەدەستی دەکەوت، چونکە باوکی خاوەنی پلەی وەك سوارەی سەربازانی سانتیاگۆ، کۆیلەفرۆش، قازیی مەرگو ژیان، فەرماندەی دلڕەقی سوپای شا بوو کە نە سوپاسی سەربازەکانی دەکردو نە داهاتە کلێسابیەکەیانی لێ دەبڕینو نە ئەو کەسانەی دەسەڵاتیان لە پاوانی خۆیان دەنا، سزا دەدا.

ئیگناچیۆ تاقە میراتگر بوو کە هیچی پێ خۆش نەبوو. ئەو لەگەڵ نیشانەکانی ئاشکرای دواکەوتووییەکانی مێشك گەورە بوو. هەتا تەمەنی پیاوەتی نەخوێندەوار بوو و کەسی خۆش نەدەویست. یەکەم نیشانەکانی ژیان لەویدا سەرەتا لە تەمەنی بیست ساڵیدا دەرکەوتن. کاتێك کە ئاشق بوو و بە مەبەستی پێکهێنانی ژیانی هاوبەش لەگەڵ یەکێك لە دانیشتوانی شێتخانەی لادڤینا پاستۆرا کە گۆرانیو قیژو قاوەکانیان هەستی منداڵانەی ئەوەیان دەلاواندەوە، ئۆگریی خۆی نیشان دا. تەنیا کچی سەرۆجی بنەماڵە کە دەبووا هونەری سەرۆجیە فێر بێ تاکوو ئەوەك دابی دووسەد ساڵەی بنەماڵەکەیان لە لاپەڕی ڕۆژگار بسڕێتەوە، کاتێك ئەقڵی لە دەست دا، دەستی لەو کارە سەیروسەمەرەیەی پیاوان هەڵگرت. ڕۆژڕەشییەکەی زۆر بە ژان بوو، بە هەوڵێکی زۆر فێریان کرد کە پیسایی خۆی نەخوات. بەڵام ئەگەر وا نەبا نەیدەتوانی هاوڕێیەکی زۆر باش بۆ مارکیزی کەم شعوور بێ.

دولچە ئۆلیڤیا تەبیعەتێکی شادی هەبوو کەسێکی دڵساف بوو. بێ سێودوو دەتزانی شێتە. تەنانەت کاتێك ئیگناچیۆی لاو بۆ یەکەم جار لەنێو قیژوقاوی سەر باڵکۆنێی دیت وەبەر دڵی کەوت، نامەیەکی لە شێوەی باڵندەیەکی کاغەزیدا بۆ نارد. ئیگناچیۆ بۆئەوەی بتوانێ وەڵامی بداتەوە، خوێندنو نووسینێ فێر بوو. ئەمە سەرەتای ئەوینێکی بەڕاستی قووڵ بوو کە

کەس نەیدەتوانی هەست بە وتایەکەی بکا. مارکیزی یەکەم کوڕەکەی لەو نەوینە مەنع کردو داوای لێکرد بە ئاشکرا حاشای لیبکا.

نیگناچیۆ وەڵامی دایەوە:" ئەمە نەك هەر راستە، بەڵکوو ریگەی پێدام دەستی لەنێو دەستی نێم." بەو دەلیلە کە دولچە شێتە دژایەتیی کرد:" ئەگەر مرۆڤ هۆی بەقوەتی هەبێ هیچ شێتێك شێت نیە."

باوکی، بە دەسەڵاتی تەواوی ئاغایەك‌و ملکدارێك، دووری خستەوە بۆ سەر ملکی خۆی. نیگناچیۆ ملی بۆ کاریش رانەکێشا.

ئەو مردوویەك بوو لە قالبێکی زیندوودا. نیگناچیۆ مریشکی لێ دەرچێ زەندەقی لە هەموو ئاژەڵان چووبوو. کاتێك لە گوندی مریشکێکی زیندووی لە نزیکەوە دیت، هەیکەلی گایەکی هێنایە بەر چاوی خۆی‌و زلتری کردەوەو تێ گەیشت بێ ئازارتر لە گیانلەبەرە ترسناکەکانی دیکەی وشکایی‌و ئاوییە. ئارەقەیەکی ساردی لە تاریکیدا کردو بێدەنگیی ترسناکی راوگە بوو بەهۆی ئەوەی لە بەرەبەیانیدا لە حاڵێکدا کە بەزەحمەت هەناسەی هەڵدەکێشا لە خەو هەستێ. سەگی راوێ کە بەبێ چاو تروکاندن لەبەرامبەر ژووری خەوی نیگناچیۆ کێشکی دەدا، زیاتر لە هەر مەترسییەکی دیکە ئۆقرەی لێ هەڵگرتبوو. نیگناچیۆ گوتی:" ژیان دەبێتە هۆی ئەوەی تاکوو لە ترس‌و دڵەراوکێدا بژین:" هاتنی بە لەسەرخۆی بوونەوەرێکی بیرمەند، ئاماژەگەلی ناخۆش، شێوەی قسەکردنی دوورو درێژو حەزیە ئوستورلاب ئەویان لە تاراوگەدا تووشی خەمۆکی کرد. وادەهاتە بەرچاو کە مەحکومە بە مانەوەی یەکجاری لە ژووری تاکەکەسیی تاراوگەدا.

پاش ساڵێك دوورخرانەوە، دەنگێکی وەك هەستانی ئاوی رووبار وەخەبەری هێنا. رووداوەکە بەم جۆرە بوو کە ئاژەڵێك بە کوێرەرێییەکدا بە ئەسپایی لە مانگەشەودا لانەکەی بەجێ هێشتبوو و چونکە بوونی وی کۆسپی سەر رێی ئاژەڵەکانی دیکە بەرەو لەوەڕگەو قامیشەڵان لە نێو شیوو زەمەنداندا بوو، بەبێ دەنگی لەسەر عەرزی تخێڵیان کردبوو. ڕەوەی گەورەی ئاژەڵان‌و ئەسپی دەسواری‌و باری لە پێشەوە دەڕۆیشتن، لە پشتەوەی وان بەرازەکان، مەڕو پەلەوەرەکان‌و تاقمە تەماشاچیتەکان کە لە ئاخی شەودا بزر بوون. تەنانەت باڵندەکان‌و کۆترەکانی ئامادەی فڕین ڕەگەڵیان کەوتن‌و بە لۆژەلۆژ لە شوێنەکە دوور کەوتنەوە. بەیانیی رۆژی دواتر، بە تەنیا، سەگی راوێ وەك کێشکگر لە بەرامبەر ژووری خەوی خاوەنەکەیدا مابۆوە. ئەمە تەقریبەن سەرەتای دۆستایەتیی مرۆڤە کە مارکیزی لەگەڵ ئەم سەگەی راوێ‌و هەموو جێنشینەکانی ئەم ماڵە پێوەند دەدا.

ئیگناچیۆی گەنج بۆ زاڵبوون بەسەر ترسی ماڵە چۆلە بە بۆ میرات ماوەکەی، پشتی لە خۆشەویستییەکەی کردو ملی بۆ داوایەکەی باوکی راکێشا. بۆ باوکی بەس نەبوو کە کوڕەکەی نەوینەکەی فوربانی بکا. لە وەسییەتنامە قانوونییەکەی خۆیدا وەك ئەرك بۆی دانا کە دەبێ لەگەڵ میراتگری یەکێك لە بنەماڵە ئیسپانیاییەکان ژیانی هاوبەش پێك بێنێ. هەر واشی لێهات. کوڕە لە زەماوەندێکی گەورەدا دونا ئولالا دی مێندۆزای بە هاوسەر هەڵبژارد. ژنێکی جوانو تا بڵێی لێهاتوو بوو، بەڵام هاوسەرەکەی هەر بە کچی هێشتییەوە بۆ ئەوەی زەحمەتی هەبوونی منداڵی نەکەوێتە سەر شان. لە بوارەکانی دیکەشدا هەر لە سەرەتای ژیانییەوە دوایەش وەك گەنجێکی بێ خێروبێر دەژیاو بەم جۆرە درێژەی بە ژیانی خۆی دا.

ئولالا دی مێندۆزا جیهانی بە هاوسەرەکەی ناساند. ئەو زیاتر دەیەویست حۆی دەربخا تا بە ئەرکەکانی رازی بێ. پێکەوە دەچوونە کلێسای گەورە. مێندۆزا بە هەڵسوکەوتێکی وەك هاوولاتییەکی باسكو بە شنێلێکی بەشکۆو باڵتۆیەکی سپیو قورسی شازادە کاستیلەوە لەلایەن ژمارەیەك ژنی کۆیلەوە کە بەرگی ئاوریشمیان لەبەر بووو زێرو زەمبەریان لەخۆ دابوو هاوڕێیەتی دەکرا. لە جیاتی نەعلەی ماڵێ کە رازاوەترین ژنانی کلێسا لە پێیان دەکرد، ئەو نیو چەکمەیەکی کۆردوبایی بە مرواری دوراوەوە وەژوور دەکەوت.

بە پێچەوانەی هەموو ئاغا گەورەکان کە کڵاوپرچی کۆنیان بە دوگمەی پیرۆزەییەوە لەسەر دەنا، مارکیز کۆتو جاکەتێکی تەنکی کەتانیی لەبەر دەکردو کڵاوێکی ئیدارییی تەنکی بێ گەڕی لەسەر دەنا. ئەو هەمیشە لە رووی ناچارییەوە دەچووە نێو خەڵکی، چونکە قەت نەی توانیبوو بەسەر ترسی خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا زاڵ بێ.

دونا ئولالا لە شاری سگوڤیا شاگردی دومەنیکو ئوسکارلاتی بوو و شەهادەی دەرسگوتنەوەی ئاوازو مۆسیقای لە قوتابخانەکاندا لە پەرستنگەکان وەرگرتبوو. ئەو لە سگوڤیاوە پارچە جیاجیاکانی پیانۆیەکی کۆنی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە بۆخۆی خستنیەوە سەریەك،و زۆر ئامرازی ژێداری بە لێزانیی تەواوەوە لێ دەداو فێر دەکرد. ئۆرکێسترای مەجلیسیی لەگەڵ راهیبەکان دامەزراندو لێدانی پارچە ﴿مۆسیقا﴾ی نوێی ئیتالیا، فەرانسەو ئیسپانیا لە شەوێدا ماڵێی پڕ لە خەڵك دەکردو دەیان گوت ئەم ئاوازانە لە باوکی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتوە.

وادیار بوو مارکیز مۆسیقای بە کەیفێ نیە. خەڵکی پەندێکی فەرانسەییان بۆ هەڵبەستبوو و دەیان گوت مارکیز دەستی هونەرمەندێكو هەستی بیستنی تۆپچییەکی هەیە. بەڵام ئەو رۆژەی کە بوخچەی کەلوپەلی مۆسیقایان کردنەوە مارکیز سووکە ئاوڕێکی لە چەنگی ئیتالیایی

سەیرو سەمەرە بە دوو ریز کووکەوە، جەعبەی سووڕان، تەختەی پانی ژێر تەلەکان، تەلی جۆراوجۆر بە مەبەستی دەنگی ساف کرد. دونا ئولالا هەموو هەوڵی خۆی وەگەڕ خست تاکوو بتوانێ دەنگی بۆڵ بە باشیی خۆی لێ بدا. ئەوان کاتی پێش نیوەڕۆی خۆیان لە ژێر دارەکانی باغی بە تەمرینێکی دژوار دەبردە سەر، دونا بە سەبرو خۆشەویستیو مارکیزیش بە کەللەڕەقیی بەردتاشێك. تاکوو ئاوازی شوانەکان بەبێ کەمترین گیروگرفت لەلایەن ئەوانەوە لێ درا.

مۆسیقا ژیانی هاوبەشی ئەو دووانەی وەها رێك خست کە دونا ئولالا غیرەتی وەبەر هات تاکوو هەنگاو بۆ پڕکردنەی بۆشایی هەڵبگرێ. لە شەوێکی تۆفانیدا، بەهۆی ترسێکی لەرادەبەدەر کە قەت هەستی پێ نەکرد، لە خەوێکی ئارامدا خۆی تەسلیمی هاوسەرە دەست وێنەکەوتووەکەی کرد.

دونا پێی گوت:" ئەمن خاوەنی نیوەی ئەم تەختە خەوەم هاتووم وەری بگرمەوە:" مارکیز خۆی راگرت. لێبڕاوانە هەولێدا بە پەنابردنو عەقڵو توندی قانعی بکا. بەڵام دونا هەروا بە دوای مەبەستی خۆیەوە بوو. ژیان دەرفەتێکی زۆری بەودووانە نەدا. لە ٩ی نۆڤەمبردا کاتێك کە لە ژێر دار پرتەقاڵەکان، لە هەوای پاكو ئاسمانی ساوو بەرزدا کە ئاسەوارێك لە هەورت تێدا بەدی نەدەکرد پارچە مۆسیقایەکیان بە دوو ئامراز لێ دەدا، لەپڕ بەر چاویان رەش هەڵگەڕا بەهۆی بوومەلەرزەو بروسکە بوورانەوە، بروسکە لە هەردووکیانی داو کەوتنە سەر عەرزی.

شار ئالۆز ببوو وا دەزانرا چونکە گوناهێك دانی پێدا نەهێنراوە تووڕەیی خوا بلێسەی سەندوە. مارکیز رێورەسمێکی شاهانەی بە خاکسپاردنی رێك خستو بۆ یەکەم جار لە بەرگی تازیەو بە روخسارێکی وەك نەخۆشان دەردەکەوت، کە دەبووا بۆ هەمیشە ئەوی لە وانی دیکە جیا بکردبایەوە. لە کاتی گەڕانەوەی لەکۆڕستانەوە بە دیتنی باڵندە کاغەزییەکان کە لەسەر دار پرتەقاڵەکانە دادەبارینە خوارێ، غافڵگیر بوو. بێ ئەوەی بیر بکاتەوە یەکێك لەوانی گرتو کردیەوەو خوێندیەوە:" ئەم بروسکەیە لەلایەن منەوە هات:"

پاش کۆتایی سەرەخۆشیی نۆ رۆژە ماڵی دنیای کە بەشێکی زۆری میراتەکەی دەگرتەوە دا بە کلێسا: لەوەرگەیەکی لە مومپێکس، لەوەرگەیەکی دیکەی لە ئایاپێلو هەشت هەزار دۆنم زەوی لە دوو مایلیی شوێنی نیشتەجێ بوونی لە ماهاتیس لەگەڵ رەوەیەکی گەورەی ئەسپانی باریو سواریو مەزرایەکی کشتوکاڵیو هەروەها باشترین کارگەی پاڵاوتنی شەکری کارائیب. ئەفسانەی سەروەتو سامانی وی هەرچۆنێك بێ بە شانو پیلو کاری لەرادەبەدەری کۆیلەکان

دەست کەوتبوو کە رەنگە سنوورەکەی خۆی لە زۆنگاوەکانی لاگوارییا و زەوییە گۆڕەکانی لایۆرتسا لە نزیك جەنگەڵەکانی مانگرۆڤی یرووبا داباو بە خەیاڵی کەس دا نەدەهات.

تەنیا شوێنێکی کە بۆخۆی هێشتەوە، خانووە دەوڵەمەندانەکەی بوو بە حەوشەی کۆیلانەوە کە ژمارەکەیانی گەیاندبووە لانی کەمی خۆیو ئاشێکیشس لە ماهاتس. ئیدارەی کاروباری ماڵیی بە دومینگا دی ئادڤینتۆ سپارد. نیپتۆنۆی پیر لە پلەی کالیسکەچیدا مایەوە کە مارکیزی یەکەم پێی دابوو چاوەدێریی ئەو برە کەرەستە پێویستانەی ماڵیی پێ ئەسپێرا کە لە عەمباری ئەسپان دا بوون.

بۆ یەکەم جار تەنیا بە هاتنەوەی، ئەو ماخولیایەی نەمابوو، نەیتوانی ساتێك لە تاریکیدا بحاوێتەوە. چونکە ترسی خانەدانیی کرئوولیی بەسەردا زاڵ ببوو کە نەوەك بەدەستی کۆیلان بکوژرێ. لەپڕ لە خەوێ راپەڕیو نەیدەزانی داخوا ئەو چاوانەی لەگەڵ هەڵئەنگوتنی تیشکی رۆژ سەیری ژوورێیان دەکرد ئی ئەم جیهانە بوون یان جیهانێکی دیکە. لەسەر نووکی پەنجەی پێی بەرەو دەرگا رۆیشت، لەنەکاو دەرگای کردەوەو رەشێکی غافڵگیر کرد کە لە کونی کلیلەوە دەیڕوانیە ژووریو ئەو دەیبیست کە ئەو ژنە چۆن وەك بەور لەبەرهەیوانێ بە لەشی رووتو چەورکراو بە رۆنی نارگیل دەخزێ تاکوو کەس نەتوانێ بیگرێ. دەستەوەستان لەبەرامبەر ئەو هەمووە ترسەدا، خێرا فەرمانیدا هەتا بەرەبەیانی چرایەکان بایسێنن. ئەو کۆیلانەی بەرەبەرە ژوورە بەتاڵەکانیان داگیر کردبوو، دەرکردن. یەکەم سەگە دەستەمۆکراوەکانی هێنانە ماڵێ.

دەرگای سەرەکیی هاتنە ژوور داخرا. ئەو سەرچەفە مەخمەریانەی کە بەسەر موبڵە فەرانسەوییەکاندا درابوونو بۆگەنیان لێ دەهات، لادران. تابلۆ چنراوەکان، شووشەواتی چینیو سەعاتە دەستسازەکانی وەستاکانیان فرۆشتن. تەنیا بە نوێنە چنراوەکان رازی بوون تا بتوانن لە ژوورە بەتاڵەکاندا خۆ لە گەرمایە بپارێزن. مارکیز ئیدی نەچۆوە تەمرینی بە کۆمەڵو رێوڕەسمە ئایینییەکانی کلێسا. ئیدی شنێلی فەرمیی پیاوماقووڵانی کلێسایی لەبەر نەکردەوە. نەچۆوە جێژنەکانو گوێی بە رۆژووان نەدەدا، بەڵام هەرچۆنێك بێ باجی راستەوخۆی کلێسای لە کاتی خۆیدا دەدا. بۆ حەسانەوەی پاشنیوەڕۆیان تەقریبەن هەمیشە دەچووە باغی بۆ بن دار برتەقاڵەکان. شێتەکان پاشماوەی خواردنەکانیان داویشتێ، بە رووخۆشیو رووهەڵماڵاوی بانگیان دەکرد. کاتێك حکوومەت پێشنیاری کرد بۆ گۆڕینی شوێنی شێتخانەی کاردروستایی بکا، ئەو بە نیشانەی رێزدانان بۆ شێتەکان ئەم پێشنیارەی قبووڵ نەکرد.

دولچە ئولیڤیا سەرکەوتوو بەسەر مەینەتیی ئەوشتانەی لەدەست چووبون، بەو بیرەوەرییە ناخۆشانەی کە قەت نەیبوون دڵی خۆی دەدایەوە، هەتا بۆی دەکرا لە باغی شێتخانەی لادڤینا پاستۆرا رای دەکرد. سەگی دەڕاوێی بە پاروان دەستەمۆ دەکردبە سەریان دا زاڵ دەبوو. وەختی خویێ کە قەت نەیبوو، بۆ ئیدارەی ماڵێی تەرخان دەکرد. ژوورەکانی بە گەسکی شاسپیریم کە بەختەوەری بە دیاری دێنێ دەماڵی‌و بەنکە سیری لە ژووری خەوێ هەڵدەواسین تاکوو تەپۆیان دەربکا.

دومینگا دی ئاڤینتۆ کە هیچ شتێکی بە قەزاو قەدەر نەدەسپارد، مرد، بێ ئەوەی سەری لەوە دەرچێ کە بۆچی بەرهەیوان لە رۆژدا خاوێنترە لە ئێواران‌و بۆچی ئەو شتانەی کە ئەو لە جێیەکی دیاریکراودا رێکی خستوون، بۆ بەیانیی رۆژی دواتر لە جێیەکی دیکەن. هێشتا ساڵێك لە مەرگی هاوسەری مارکیز تێ نەپەڕیبوو کە ئەو بۆ یەکەم جار دولچە ئولیڤیای لە کاتی سڕینەوەی کەلوپەلی مەتبەخدا غافلگیر کرد کە بۆچی بە رادەی پێویست خەریکی پاك‌و خاوێنیی کۆیلەکان نابێ.

مارکیز گوتی:" بە بیرم دا نەدەهات ئەتۆ پێت لە بەرەی خۆت زیاتر راکێشی."

وەڵامی دایەوە:" چونکە ئەتۆ هێشتا هەر ئەو چارەڕەشەی."

بەم جۆرە دۆستایەتییەکی قەدەغەکراو، کە هەمیشە وێکچوونێکی لەگەڵ خۆشەویستی هەبوو، سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. ئەوان تاکوو کەڵەشێر بانگی دەدا، بە دوور لە گاڵتەو رق‌وقین، وەك ژن‌ومێردێکی پیر، کە مەحکوومن بە هاوڕەنگی، پێکەوە خەریکی گفت‌وگۆ دەبوون. ئەو دووانە پێیان وابوو، بەختەوەرن، رەنگە واش بووبن، هەرکە یەکێکیان وشەیەکی زیادیی بە زمانی داهات یان هەنگاوێکی کەمتر هەڵدێنایەوە، شەوەکانیان بە شەڕو هات‌و هاوار تێك دەچوو، بەوجۆرەی کە سەگی ئێشکچیان زنجیری دەپساند. دواتر هەموو شتێك لە هەوەڵەوە دەستی پێ دەکردەوە تا ئەوەی کە دولچە ئولیڤیا بۆ ماوەیەکی زۆر ماڵێی بەجێ هێشت.

مارکیز لەلای وی دانی بەوەدا هێنا کە تەقوا هۆی سەرەکیی پشت تێکردنی لە ماڵی دنیایەو ئاڵۆگۆڕی دەروونیی ئەو نەبووە، بەڵکوو رزگاریی وی زیاتر بەهۆی تێکرووخانی ئیمانی وی لە کاتێك دابووە کە بەهۆی بروسکە لەشی خێزانی وەك خەڵووزێ ڕەش هەڵگەڕاوە. دولچە ئولیڤیا هەوڵی دا نارامی بکاتەوە. بەڵێنی پێ دا لە ماڵێ‌و لە سەر جێی خۆی تەسلیمی وی بکا. بەڵام مارکیز قبووڵی نەکرد.

ئەو سوێندی خوارد:" ئەمن تازە قەت ژیانی هاوبەش پێك نایەنەوە."

بەڵام هێشتا ساڵێك تێوەرنەسووڕابوو بە دزی لەگەڵ بێرناردا کابێرێڕا ژیانی هاوبەشی پێك هێنا. ئەو کچی پیاوێك بوو کە لە سەردەمی باوکی مارکیزدا کێشکچی بوو و لە بواری کڕین و فرۆشتنی مەوادی خۆراکی دا جێگەیەکی باشی بۆخۆی گرت. ئەوان کاتێك یەکتریان ناسی کە باوکی بێرناردا ڕای سپارد تاکوو ماسیی باقۆی خوێلێدراو وێڕای زەیتوون بباتە ماڵە دونا ئولالا کە تووشی لاوازی ببوو. کاتێك هاوسەری مارکیز مرد دیسان ماسیی باقۆی بۆ دێنا. ڕۆژێك دوای نیوەڕۆیە، کاتێك بێرناردا لە نوێنی نێو باغێ دا لەگەڵی بەرورو بوو، چارەنووسی دیاریکراوی مارکیزی لە رووی بەری دەستی چەپیەوە خوێندەوە. مارکیز کەوتە ژێر کاریگەریی بۆچوونە ڕاستەکانی، بەجۆرێك کە تەنانەت ئەگەر نەشیویستبا شتێك بکڕێ، بەڵام ئیزنی دا لە کاتی خەسانەوەی پاشنێوەڕۆیاندا هەروا بێتە لای. دوو مانگ تێ پەڕی بێ ئەوەی مارکیز هیچ شتێك ئامادە بکا. کەوابوو بێرناردا بەرنامەی ئامادەکاریی ئەوی بە ئەستۆوە گرت. بە حاڵەتێکی هێرشبەرانە وەسەر نوێنان کەوت. بە پەرۆی بەرگی گوندنشینان تێکیوەپێچا، بە جۆرێك کە ئیدی هیچی بۆ نەدەکرا. پاشان دیسان بەزیرەکیو بەگەرمای لەش تەزووی خۆشیی پێ داهێنا، بەجۆرێك کە لە ئارەزووی غەمگینی خۆیدا، نەیدەتوانی بزانێ لەززەتی تەنیایی خۆی چەندەو بەبێ هیچ شانازییەك پاکیەکەی بە تالان برد. ئەو پەنجاو دوو ساڵ بووو بێرناردا بیستو سێ ساڵ، بەڵام جیاوازیی تەمەن ئاکامێکی دژواری نەبوو.

ئەم دووانە وەك کاتی حەسانەوەی پاشنێوەڕۆیان هەروا یەکتریان خۆش دەویست، بزۆزو بێ هەست لەژێر سێبەری فریشتەئاسای دار پرتەقاڵاندا.

شێتەکان بە گوتنی گۆرانیی بێ شەرمانە لەسەر باڵکۆنێ، دەبوونە هۆی خۆشحاڵیی ئەوانو ئەو سەرکەوتنەیان بە چەپڵەلێدان وەك هاندانی تەماشاچیانی یانەی وەرزشی جێژن دەگرت. بەر لەوەی مارکیز بەو مەترسیانە بزانێ کە هەڕەشەیان لێ دەکرد، بێرناردا بە ڕاگەیاندنی هەواڵی دووگیان بوونی خۆی بە مارکیز لە مانگی دووەمدا، ئەوی لە دنیای بێ خەبەری دەرهێنا. پێیگوت کە قەت ڕەشپێست نەبووە، بەڵکوو هیندییە سوورێکی نیمچەدورگەی پیرنەو دایکی سپیپێستێکی خەڵکی کاستیل بووە، کەوابوو شەرەفو ناموسیان بە رواڵەت تەنیا دەکرا بە دەرزیی پێکەوەنانی ژیانی هاوبەش بدروێتەوە. مارکیز کچەی خافڵاند تاکوو باوکی چەکی گەرمی ئارکاییەکەی داپۆشێو لەکاتی پشووی پاشنیوەڕۆیەدا لە دەرگای دا. ئەو لەسەرخۆو بە ئیماو ئیشارە قسەی دەکردن، بێ ئەوی سەیری دەموچاوی مارکیز بکا چەکەکەی دایە.

لێی پرسی:" بەڕێز مارکیز، دەزانی ئەوە چیە؟"
مارکیز نەیدەزانی بەو چەکەی بەدەستیەوەیە چ بکا.
ئەو گوتی:" ئەوەندەی ئەمن بیناسم پێم وایە ئەوە دەبێ چەکی نارکایی بێ." ئەو زۆر بە سەرسوڕماوییەوە گوتی:" بۆ چ مەبەستێك کەلك لەوە وەردەگری؟"
وەڵامی دایەوە: ((بۆ ئەوەی کە لە بەرامبەر دزە دەریاییەکاندا بەرگری لە خۆ بکەم قوربان.)) دیسان هەر چاویشی لە روخساری مارکیز نەکرد. " ئێستا ئەو چەکەم بۆیە لەگەڵ خۆم هێناوە رێزی خۆت بە من بسەلمێنیو پێش ئەوەی بتکوژم، بمکوژە."
مارکیز سەیرێکی دەموچاوی کرد، چاوی غەمگینو نامۆو چووکە بوون. بەڵام مارکیز زانی چی لە دڵی دایە. چەکە گەرمەکەی دایەوەو بانگهێشتنی کرد بۆ ماڵێ تاکوو رێگە چارەیەك بدۆزنەوە. دوو رۆژ دواتر قەشەی نزیکترین کلێسا، بە ئامادەبوونی دایكو باوكو شاهیدەکان، مارەیان کرد. دوای ئەوە ساگونتا لە گۆشەیەکەوە پەیدا بووو تاجە گولێکی لەسەر بووكو زاوا بەختەوەرەکە نا.
رۆژێکی بەیانی لە کاتی بارانەدا سییەرڤا ماریا دی تودوس لوس ئانجەلێس وەك پشتو پەنای مەعقوولی وان ساغو سلامەت بە حەوت مانگی چاوی بۆ دنیا هەڵێنا. ئەو وەك جوچکە بۆق رەنگ بزرکاو بوو. زۆری نەمابوو نێوکی کە لە ملی ئالابوو، بیخنکێنێ.
مامان گوتی :" کچە، بەڵام ناژیە."
ئەوکات دومینگا دە ئادڤینتۆ شوکری خوای کردو بەڵێنی دا ئەگەر تەمەنی بە نسیب بکا هەتاکوو مێردی دەکا پرچی بۆ کورت نەکاتەوە. کاتێك منداڵە قیژاندی، دایکی تۆزقالێکیش هەستی بە خۆشحاڵی نەکرد. دومینگا دی ئادڤینتۆ بە خۆشحاڵیەوە هاواری کرد " دەبێتە مرۆڤێکی پیرۆز!" مارکیز لە نێوان خەوو بێداریدا بوو کە لەگەڵ روخساری خاوێنو دە مەلۆتکە پێچراوی منداڵەکە ئاشنا بوو.
کچۆڵە منداڵی خانەدانێکی بە ئەسڵو فەسڵی لە مێژینە، لە سەردەمی منداڵەتیدا بەردەوام سەرکوت کرابوو. دایکی تاقە جارێکی مەمکی دابۆیەو پاشان لێی بێزار ببوو. تەنانەت ئەوەندە دەترسا کە دەیویست بیکوژێو لە پەنای نەمێنێ. دومینگا دی ئادڤینتۆ، سییەرڤا ماریای حەواندەوە. لە کلێسای مەسیحی منداڵەی غوسلی تەعمید داو پەنای بۆ ئولوکون یەکێك لە خواکانی یورووبا بردکە رەگەزێکی نادیارو روخسارێکی ترسناکی هەبوو تاکوو کارێکی بکا ئەم کچە هەمیشە لە خەونەکانی خۆیدا بژیو لە پشت پەردەوە لە نێو

خەلکیدا دەرکەوێ. سییەرڤا مارییایان نارده حەوشی کۆیلەکانو لەوێ بەر لەوەی قسان فێر بێ، سەمای فێر بوو. هاوکات سێ زمانی ئەفریقایی فێر بووو فێر بوو بە گەدەی بەتاڵ خوێنی مریشکێ بخواتەوەو بێ ئەوەی ببینرێو کەس لێی ببیسێ، وەك گیانلەبەرێکی بێ جیسم لە نێو مەسیحییەکاندا بێو بچێ. دومینگا دی ئادڤینتۆ لە چەشنی بنەماڵەی شا دەورویەری ئەوی بە خۆشی پڕ کرد لە کۆیلەی رەشو کارەکەری دوو رەگە کە هەموویان لە ناوی رەوانو سازگاردا خۆیان دەشورد. ئەوان بە گیای پیرۆزی مایایی خۆیان دەشوردو بسکی ناڵەناڵەی کچۆڵەی پێنج ساڵەیان چەشنی باقە گوڵێکی سوور دەرازاندەوە کە بەقەد بەژنی درێژ بوو. کۆیلەکان بەرەبەرە ملوانکەی خوای جۆراوجۆریان بە ملیەوە هەڵداوەسی کە ژمارەیان دەگەیشتە شازده دانە.

هاوکات بێرناردا بە دەسەڵاتی تەواوەوە بەسەرکاروباری ماڵێ دا زاڵ ببووو مارکیزیش بە خەموخەفەتەوە بە سەوزییەکانی باغەوە سەرقاڵ بوو. بێرناردا بە پلەی یەکەم هەوڵی دا سامانی دابەشکراو لەلایەن مێردەکەیەوە بەدەست بێنێتەوە، بۆیە پێی لەسەر سامانەکانی مارکیزی یەکەم داگرتەوە. ئەو لەسەردەمی خۆیدا ئیزنی فرۆشتنی پێنج هەزار کۆیلەی لە ماوەی هەشت ساڵدا بەدەست هێناو هێندێك بەڵێنی قبووڵ کردبوون کە لە بەرامبەر هەر کۆیلەیەکدا دوو تا ئارد بێنێ. لە سایەی تەڵەکەبازیی لێزانانەی مارکیزی یەکەمو بەرتیل خۆریی کارمەندانی گومرك، توانی نەك هەر ئەو ئاردەی معاملەی لەسەرکرابوو، بەڵکوو سێ هەزار کۆیلەی دیکەش وەك باری قاچاغ بفرۆشێ، موعامەلەیەك کە ئەوی کردە سەرکەوتووترین بازرگانی سەدە.

بێرناردا بیری لەوە کردەوە کە نەك بە کۆیلە، بەڵکوو دەتوانێ بە ئاردی موعامەلەیەکی باش بکا. بەڵام گەورەترین موعامەلە باوەڕبەخۆبوونێکی سەیری وی بوو. ئەو، ئەو ویستەی خۆی کرده بەرنامەی ژیانی خۆی کە لەماوەی چوار ساڵاندا بە ئیمتیازێك، هەزار کۆیلە بفرۆشێو لە بەرامبەر هەر کۆیلەیەکدا سێ تا ئارد بێنێ: بەپێی ئەو رێککەوتنە هەزار کۆیلەی فرۆشتو لە جیاتی سێ هەزار تا ، دوازدەهەرزار تا ئاردی هێنا. ئەمە گەورەترین قاچاغی سەده بوو.

بێرناردا لەو کاتانەدا نیوەی کاتی خۆی لە کارگەی پاڵاوتنی شەکری ماهاتیسدا بەسەر دەبردو موعامەلە سەرەکیەکانی خۆی لەوێوە ئیدارە دەکردن، چونکە رێۆگراندە دی ماگدالینا نزیکی داراییەکانی شا بوو هەموو موعامەلە نێوخۆییەکان لەوێڕا دەستیان پێ دەکرا. هەواڵی پچڕپچڕ لە سەرکەوتنی ئابووریی ئەو دەگەیشتە ماڵە مارکیزی، کە هیچ حیسابێکی لە بەرامبەریاندا نەدەدا. بەڵام کاتێك لێره دەژیا، تەنانەت پێش قەیران وەك سەگی راوێ لە حەبسدا بوو. دومینگا دی ئادڤینتۆ بۆچوونێکی جوانی هەبوو:

" بێرناردا لە ئاشی سەرێ لێ دەکا."

سییەرڤا ماریا پاش مەرگی کچی یەکێك لە کۆیلەکان، بۆ یەکەم جار جێگەیەکی سابیتی لە ماڵێدا بۆ پەیدا بوو. ژووری بەشکۆی خەوی مارکیزی یەکەمیان بۆ رێکوپێك کرد. ماموستای بنەماڵەیان بۆ دیاری کرد تاکوو وانەی ئیسپانیایی و ئوروپایی فێر بکەن و هەروەها ژماردنی ژمارەو زانستە سروشتییەکان فێر بێ. ماموستا هەوڵی دا خوێندن و نووسینی فێر بکا. سییەرڤا ماریا نەی دەهێشت و دەیگوت:" لە ئەلفوبێ حاڵی نابێ." خانمێکی مۆسیقازان کە ناوبانگی جیهانیی هەبوو، لەگەڵ مۆسیقای ئاشنا کرد. کچۆڵە ئۆگرییەکی زۆری لە خۆی نیشان دا، بەڵام تاقەتی ئەوەی نەبوو کە فلان ئامرازی مۆسیقا فێر بێ. خانمی ماموستا بە خەفەتەوە دەستی لە فێرکردنی وی هەڵگرت و لەکاتی ماڵاوایی دا بە مارکیزی گوت:

" وا نیە منداڵەکەتان لەهیچ شتێکدا لێهاتوو نەبێ، بەڵکوو ئەو هەر سەر بەم دنیایەش نیە."

بێرناردا دەویست لە کینەی خۆی کەم بکاتەوە. بەڵام زۆر زوو دەرکەوت کە نە خەتای ئەمە و نەخەتای ئەو. بەڵکوو خەتای سەرەکی سروشتی ئەم دوو مرۆڤە بوو. لەو کاتەوە کە بێرناردا هێندێك حەز بە جندووکانی لە کچەکەیدا بەدی کردبوو، ترسێکی وەك مەرگ سێبەری خستبووە سەر ژیانی. بێرناردا تەنیا بیری لەوە دەکردە کە ئەگەر ساتێك ئاوڕ وەپشتەوە داتەوە و بەبێ هیچ هۆیەك چاوەترسناکەکانی بوونەوەرێکی داهێزراو ببینێ کە لە بەرگێکی بۆنخۆشداو پرچی تا چۆکان درێژ راوەستاوە، لەشی دەلەرزی. بێرناردا هاواری کرد:" هۆی منداڵ، بۆت نیە ئاوا سەیری من بکەی!" کاتێك بە تەواوی فکری لەسەر موعامەلات خڕ دەکردەوە، لە پاشەستۆی ڕا هەستی بە هەناسەی مارێکی کەمین گرتوو دەکرد و لەبەر شیددەتی ترسێ هەڵ دەبەزی.

هاواری دەکرد:" هۆی منداڵ، پێش هاتنە ژوور لە دەرگای بدە!"

کچۆڵە بە خوێندنی هێندێك دوعا بە زمانی یورروبایی ترسی بێرناردای زیاتر دەکرد. شەوانە لەوەش خراپتر بوو، بێرناردا لەپڕ لە خەوێ ڕادەبوو، پێی وابوو کەسێك دەستی پێدادێنێ. ئینجا کچەکەی دەدیت کە لە پەنا تەختی خەوێ راوەستاوەو سەیری خەولێ کەوتنەکەی دەکرد. دانانی زەنگی پەنا دەرگای هیچ سوودێکی نەبوو. سییەرڤا زەنگی لێ نەدەدا، چونکە زۆر بە پارێزەوە دەرۆیشت. دایکی دەیگوت:" ئەم بوونەوەرە تەنیا رەنگی پێستی لە سپیپێستان پێ گەیوە." ئەم قسەیە تا ئەوکاتە راست بوو کە کچۆڵە تەنانەت ناوێکی ئەفریقایی بۆخۆی هەڵبژاردو هەر بە پێخۆشبوون وێڕای ناوی خۆی بەکاری دێنا: ماریا ماندینگا.

سەرلەبەیانیی رۆژێك لە رۆژان قەیرانێك لە نێوانیاندا ساز بوو. زۆر خواردنی کاکائۆ ببووە هۆی تینوویەتیی لە رادەبەدەری بێرناردا، بۆیە لەخەو هەستاو لەبنی تونگەی ناوێدا بووکە شووشەی سییەرڤا ماریای لە ناوێدا دیت. بۆ بێرناردای ئەو بووکەشووشەیەکی سادە نەبوو کە لە ناوێدا رەمەلە کەوتبوو، بەڵکوو شتێکی بە جووڵە بوو: بووکەڵەیەکی مردوو.

گومانی نەبوو کە رووداوەکە بە جۆرێك پێوەندیی بە جادووی ئەفریقاییەوە هەیە کە سییەرڤا ماریا لە دژی دایکی بەکاری دێنێ، بریاری هەردووکیان ناتوانن پێکەوە لە ماڵێکدا بژین. مارکیز هەوڵی دا نێوبژیوانێ لەگەڵ ترسو لەرزدا بکا بەڵام بێرناردا بە توورەییەوە قسەکانی پێ بڕی:" یان ئەمن دەبم یان ئەو." بەم جۆرە سییەرڤا ماریا دیسان چۆوە نێو کچە سەر بە کرێژەکانی کۆیلەو تەنانەت ئەگەر دایکی لە کارگەی پالاوتنی شەکریش بووایە، دیسان هەر لەوێ دەژیا. کچۆڵەش هەروەك سەرەتای لەدایکبوونی کەمترین سوودی لە خوێندن وەرنەگرت.

بەوحاڵەش بێرناردا چاکتر نەبوو. ئەو هەوڵی دا یەهوودای ئەسخەر یووتی لەلای خۆی رابگرێ، چونکە لەگەڵ خۆی دەهاتەوە. ئەم کارە بوو بەهۆی ئەوەی لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵدا موعامەلاتەکەی و تەنانەت ژیانیشی لەبەر دەستی خۆی نەبێ. بێرناردا یەهوودای وەك دزە دەریاییەکانی نووبی و ئاس دیل و شای رووناکی لێ کرد. کاتێك کەشتیە بارهەڵگرەکان لەنگەریان دەگرت و شار لە جێژنی شەش مانگەدا مەست دەبوو، لەگەڵ خۆیدا دەیبردە دەرەوەی شاری. لە دەرەوەی دیواری شاری بۆ بازرگانان، پیالە فرۆشیگەلێك کە پێشتر بیریان بۆ نەکرابۆوە لە شوێنی سۆزانیەکان دامەزرابوون. زۆربەی بازرگانان لە لیما، پۆرتۆ بلوو، هاڤاناو ڤێراکرووزەوە دەهاتن و لەسەر قوماش و شتومەکی جیهانی تازە دۆزراوە خەریکی دەمەقاڵێ دەبوون. شەوێك، مەستێك ئەوی کێشایە پیالەفرۆشیی نێو کەشتییەکی هەڵگری کۆیلەکان. یەهوودا بە نهێنیکارییەکی زۆرەوە هاتە کن بێرنارداو گوتی:

" چاوان داخەو زارت بکەوە!"

بێرناردا بە قسەی کردو یەهوودا بەستەیەك چوکلێتی جادوویی دروستکراوی نواکساکای لە سەر زمانی دانا. بێرناردا تامەکەی ناسیەوەو رۆی کردەوە، چونکە هەر لەسەردەمی منداڵیەوە قەت رووی لە چوکلێت نەبووە. یەهوودای پێی سەلماند کە ئەوە شتێکی پیرۆزەو کە خۆشی بە ژیان دەبەخشێ، هێزی مرۆڤ زیاد دەکاو مرۆڤی خۆشحاڵ دەکاو توانای جینسیی زیاد دەکا.

بێرناردا پێکەنینێکی وەك گرمەی هەورێ کردو گوتی:" ئەگەر وا بووایە دەبووا هەموو راهیبەکانی سانتاکلارا بە راستی ببانە گای شەڕی."

ئەو هەنگوینە کولاّوەی کە پێش زەماوەند لەگەڵ کچانی هاوپۆلی خۆی خواردی‌و پاشان هەر وا دەی‌خوراد، ئەویش نەك هە ربە زمانی بەڵکوو بە هەر پێنج هەستی و لە هەوای گەرمی کارگەدا، ئێستا ببووە هۆی لاوازیی جەستەیی بێرناردا. بێرناردا جوتنی تووتن‌و گەڵای یارومایی لە ئەسخەر یووتییەوە فێر بوو. راست وەك هێندییە سوورەکانی سییەرڤا نیڤادا. ئەو لە مەیخانە حەشیشی هیندی، ناسی قویرسی، دەرمانی وزەبەخشی دروستکراو لە کاکتووس لە رینال دی کاتورسی‌و لائی‌کەم جارێك کێشانی تریاکی لە کن فرۆشیارانی مانیلیی کەشتیی بازرگانی بە تاقی کردبۆوە. دیارە ئەگەر ئەسخەر یووتی بۆ باسی باشییەکانی کاکائۆ کردبا دەی بیست. کاتێك بێرناردا هەموو شتەکانی دیکەی تاقی کردنەوە، زانی کاکائۆ لە هەمووان باشترە. ئەوی لەسەرەوەی هەمووان دانا. ئەسخەر یووتی دەبوو بە دز، دەبووە راخەرو بۆی هەڵ کەوتبا نێریبازیی دەکردو هەموو کارێکی دەکرد بێ ئەوەی پێویست بن، چونکە کەموکورتیییەکی لە خۆیدا شك نەدەبرد. لە شەوێکی تووشدا لەسەر قوماری پەڕان بە دەستی بەتاڵ لەگەڵ مەلەوانان لێی بوو بە شەڕ، ئەوان لە پێش چاوی بێرناردا بە کورسیان تێروپڕیان تێ هەڵدا.

بێرناردا رای کرد بۆ کارگەی پالاّوتنی شەکر. مالێ بەبێ بەڕێوەبەر هەڵدەسووڕاو ئەگەر ئەوکات لەبەریەك هەڵنەوەشا تەنیا لەبەر دەستی مانددوو و هەولّی دومینگا دی ئادڤینتۆ کە جێگەی رێزلێنان بوو: ئەو هەر بەو جۆرەی کە خواکانی دەیانەویست سییەرڤا ماریای گەورە کرد. مارکیز تەقریبەن لە بارەی داماویی ژنەکەی هیچی نەدەزانی. لە کارگەی پالاّوتنی شەکرەو هێندێك شتی لێرەولەوێ دەبیست کە بێرناردا لە قەیرانی رووحیدا دەژیەو لەگەڵ خۆی ورێنەی دەکاو باشترین کۆیلەکان هەڵدەبژێرێ تاکوو شەوانی رۆمیی خۆی لەگەڵ کچانی هاوپۆلیدا بەش بکا. ئەو سامانەی بە ئاسانی دەستی کەوتبوو بە فێڕۆ دا. ئەو لەبەرامبەر شووشە هەنگوینەکان‌و کیسە کاکائۆیەکاندا کە لە کەلێن‌و قوژبنناندا تاقەتی کردبوون بە چۆکدا هاتبوو تاکوو هیچ دەرفەتێکی لە کیس نەچێ‌و بتوانێ ئیشتیای خۆی دامرکێنێ. تەنیا شتێکی بە دڵنیایی بۆ مابۆوە بریتی بوو لە دوو گۆزەی سوالّەتی پڕ لە سکەی زێڕی خالیس کە بێرناردا لە ماوەی سالاّنی دەستڕۆیشتوویدا، لەژێر تەختی خەوی‌دا دەعەرزیی نابوون. پاش سێ سالّی تەواو، کاتێك بۆ دوایین جار لە ماهاتێسەوە هاتەوە مالێ، لە وەزعێکی‌وا دا بوو کە مێردەکەی نەی دەناسیەوە. گەڕانەوەی وی کەمێك پێش ئەوکاتە بوو کە سییەرڤا ماریا سەگ گەستی.

نێوەڕاستەکانی مانگی مارس بە روالّەت مەترسیی هاری رەویبۆوە. مارکیز شوکرانە بژێر لە چارەنووسی خۆی بڕیاری دا رابردووی قەرەبوو بکاتەوەو لەسەر داوای ئابرێ نۆنچیکۆ دلّی

کچەکەی هێنایەوە جێ. هەموو کاتەکانی خۆی بۆ کچەکەی تەرخان کرد. ئەو دەیەویست فێری شانەکردنو هۆنینەوەی پرچی کچۆڵەکەی بێ. دەیەویست فێری کچۆڵەکەی بکا کە سپیپێستێکی رەسەن بێ. هەوڵی دەدا خەونە وەدی نەهاتووەکانی خانەدانە کرئوولییەکەی خۆی بۆ کچۆڵەکەی زیندوو بکاتەوە. هەوڵی دا خواردنی مارمێلکەی خوێ لێدراوو شۆرباوگۆشتی گیانلەبەر شیردەرەکانی پێ تەرك بکا. ئەو تەقریبەن بێ ئەوەی لە خۆی بپرسێ داخوا لە چ رێگەیەکەوە دەکرێ کچۆڵەی بەختەوەر بکا، دەستی بۆ هەموو شت برد.

ئابرێ نۆنچیکۆ هەروا سەری لە ماڵێ دەدا. گونجان لەگەڵ مارکیزی بۆ وی کارێکی بە زەحمەت بوو. بەڵام بیری بە بێ خەمیی مارکیز لە بەرامبەر جیهانی نیگەران لە پشکنینی بیرو باوەڕەوە خەریك بوو. بەم جۆرە مانگە گەرمەکانی هاوینێ تێ پەڕین. ئابرێ نۆنچیکۆ لە ژێر شکۆفەی دارپرتەقاڵەکان قسەی دەکرد بێ ئەوەی کەسێك گوێ بۆ قسەکانی رادێرێو مارکیز بە مەودای هەزراو سێسەد مایلی دەریایی دوور لە پاشایەك کە هیچی لێ نەبیستبوو لە نوێنی خۆیدا جینگڵی دەدا. لە یەکێك لەم چاوپێکەوتنانەدا شینوگریانی بێرناردای قسەی پێ بڕین.

ئابرێ نۆنچیکۆ گوێقوڵاغ بوو. مارکیز خۆی لە گێلێ دا. بەڵام گریانو رۆرۆی دوایی ئەوندە لەکوڵ بوو کە نەی توانێ بێهەڵوێست بمێنێتەوە.

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" گرنگ نیە کێیە، پێویستە جوابی بدرێتەوە."

مارکیز گوتی:" ئەو هاوسەری و دووەمە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" جەرگی زۆر وێرانە."

" ئەتۆ ئەوەی لە کوێ دەزانی؟"

پزیشکەکە گوتی:" چونکی زاری دەکاتەوەو دەناڵێنێ."

بە بێ ئیزن دەرگای کردەوەو هەوڵی دا لە ژووری نیوە تارکدا بێرناردای بناسێتەوە. بەڵام ئەو لە نێو تەختی خەوێدا نەبوو. بێرناردای بە ناو بانگ کردو وەڵامی نەبیستەوە. پاشان پەنجەرەی کردەوەو تیشکێکی ڕووناکایی ئاسنین، سەعات چواری پاشنیوەڕۆی پیشان دەدا کە بێرناردا بە رووتی بە شکڵی خاچ لەسەر عەرزی راکشابوو و بۆنی کوشندەی هەناسە دایپۆشیبوو. رەنگی بە رووانەوە نەمابوو بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو زەرد هەڵگەڕابوو.کە دەرگایەکە لە پڕ کرایەوە، بەر چاوی تاریك بوو، سەری هەڵێناو لە بەر ڕووناکی پزیشکی ناسیەوە. بۆ پزیشکەکە چاولێکردنێك بەس بوو بۆ ئەوەی چارەنووسی بێرناردی لە پێش چاوی خۆی ببینێ.

پزیشکەکە گوتی:" کچم، کوندە بەبوو بانگت دەکا." و بۆی باس کردن کە هێشتا بۆ نەجاتی وی درەنگ نیە بە مەرجێك بۆ ئەوەی خوێنی بپالێورێ خێرا دەبێ بە چارەسەری هەتوانی گیایی رازی بێ. بێرناردا ئەوەی ناسیەوە، بە زەحمەتێکی زۆر پشتی راست کردەوەو دەستی کرد بە جنێوان.

ئابرێ نۆنچیکۆ گوێی بەو قسانە نەداو هەر لەو کاتەدا خەریکی داخستنی پەنجەرەی بوو. بەر لەوەی ماڵەکەی بە جێبێڵێ، جارێکی دیکە چووە کن جێگای مارکیزی‌و بە وردی ئەوەی بۆی چووە بۆی پێشبینی کرد:

" ئەگەر خانی مارکیز خۆی بە دارتەلی خانووەکەوە هەڵناوەسێ، تاکوو ۱۵ی دیسامبر دەمرێ."

مارکیز بە ئارامی گوتی:" بەداخەوە هەتا ۱۵ی دیسامبر زۆرمان ماوە."

پزیشك درێژەی بە ئەگەری چارەسەری سییەرڤا ماریا دا. ئەوان لە کوێستانەکانی سان لازارۆ، زۆنگاوەشکبووەکانی رۆژهەڵات، خۆری گەورەو سوور کە لە بڵێسەی زەریادا نوقم دەبوو، دەبینران. کچۆڵە لێی پرسی ئەو بەری دەریا چی لییە. ئەو وەڵامی دایەوە:" جیهان." پزیشك بە گوێرەی هەوڵەکانی خۆی لەرێنەوەیەکی چاوەڕوان نەکراوی لە دەنگی کچەدا هەست پێ دەکرد. پاشنیوەڕۆیەکی گەمیە چارۆکەدارەکان کەشتییەکی بازرگانیان لە ئاسۆی دیت کە زیانی پێ گەیبوو.

شار دەگۆڕا. باب‌و کچ بە دیتنی ئەو بووکۆڵانەی سەرشانۆی کە ئاگریان هەڵدەلووشی‌و زۆر شتی نوێی بازاری ساڵانە کە هەموو بەهاران لەبەر خۆشنشانسی دەهاتنە بەندەر، دڵخۆش دەبوون. سییەرڤا ماریا لە ماوەی دوو مانگاندا رۆژلەگەڵ رۆژ لە بارەی سپیپێستانەوە زۆر شت فێر بوو. مارکیز کە هەوڵی دەدا ئەوی بکاتە مرۆڤێکی دیکە بۆخۆشی بەجۆرێك هەستی بە گۆڕان کرد. ئەم گۆڕانە نەك هەر لە رەفتاریدا بەڵکوو بە رواڵەت گۆڕانی لە وجوودیشی دا بە دواوە بوو.

ماڵێ پڕ بوو لە سەماکەرەی قورمیشی، ئامرازی مۆسیقا، یەدەکی میکانیکیی سەعات کە هەموو ساڵێ لە بازاڕەکانی ئورووپادا دەبینران. مارکیز کاسەی چەنگی ئیتالیایی بە دەستەوە گرت، تەلەکانی بادان‌و وای بە لە خۆڕادیتووییەوە لێ دەدا کە تەنیا دەکرا بە عیشق پێناسە بکرێ‌و لەگەڵ ئەوەشدا بە گۆرانییەکانی رابردوو وێڕای دەنگی چەنگی بۆخۆشی دەیگوت. بەڵام گوێ نەبوو بیبیسێ، گۆرانییەکان هیچیان لە بارەی تێپەڕینی ساڵەکان‌و بیرەوەرییەتاڵەکاندا

تێدا نەبوو. لەو ڕۆژەدا سییەرڤا ماریای لێی پرسیبوو ئەرێ ئەوەی گۆرانییەکان باسی دەکەن ڕاستە کە ئەوین هەموو کارێکی دەتوانێ بکا.

مارکیز وەڵامی دایەوە:" ڕاستە، بەڵام ئەتۆ کاری باش دەکەیو کەچی باوەڕ ناکەی."

مارکیز بەهۆی ئەو هەواڵە خۆشو تازانەوە دڵی خۆش بوو سەفەرێکی بۆ سەڤیلا ڕێك خست تاکوو بیر بکاتەوەو سییەرڤا ماریا بتوانێ لەو خەمو خەفەتە شاراوانەی خۆی دەرباز بێو لە رووی پەروەردەییەوە بۆ ژیان پێی بگەیەنێ. کاتێ سەفەرو بەرێکردن یەکلا ببۆوەو کە کاریداد دیل کوبرێ بە هەواڵێکی ترسناك حەسانەوەی پاشنیوەڕۆیانەی لێ تێك دا:

" ئاغا بچووكو بێ چارەکەم، ئێستا کچەکەت دەبێتە سەگ."

ئابرێ نۆنچیکۆ بەپەلە گەیشتێو خورافاتە بێ نێوەڕۆکەکانی ڕەت دەکردنەوە کە دەیانگوت ئەوانەی نەخۆشیی هاریان تووش بووە ئاخیرەکەی وەك ئەو ئاژەڵانەیان لێ دێ کە گەستوویانن. ئەو ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە کچە کەمێکی تا لێیە، هەرچەندە تا بۆخۆی نەخۆشییە بەڵام نیشانەی نەخۆشییەکانی دیکە نییەو نەیدەویست لەم بارەوە زیاتری لەسەر بڕوا. ئەوەی بۆ باوکە نیگەرانەکەی پشتڕاست کردەوە کە کچۆڵە لە بەرامبەر هیچ نەخۆشییەکدا ئەمین نییە، چونکە سەگێك بیگەزێ چ هار بێ چ نەبێ، لە بەرامبەر ڤاکسەندا خۆڕاگرە. وەك هەمیشە تاقە ڕێگایەك هەبوو: چاوەڕوانی. مارکیز پرسی:

" ئەمە، هەموو ئەو شتانە بوون کە دەتەویست بە منیان بڵێی؟"

پزیشکەکە بە تاڵیو بەبێ باکی وەڵامی دایەوە:" زانست نیزنم پێ نادا لەمە زیاترت پێ بڵێم. بەڵام ئەگەر باوەڕ بە من ناکەی هێشتا ڕێگای دیکەت لە پێشە: پشت بە خوا ببەستە."

مارکیز تێ نەگەیشت.

ئەو گوتی:" ئەمن دەتوانم سوێندێ بخۆم ئەتۆ بێ دینی."

پزیشکەکە بێ ئەوەی رووی تێبکا:" بە ڕای تۆ ئەدی چ بووایەم، سینیۆر."

مارکیز باوەڕی بە خوای نەبوو، بەڵکوو باوەڕی بە کەسێك بوو کە بە جۆرێك هیوای لە دڵی دا پێك هێنابا. سێ پزیشکی خوێندەواری دیکە، شەش دەرمانخانە، یازدە دەلاکی ڕەگ زەنو ژمارەیەکی یەکجار زۆر جادووگەری شیفابەخشو مامۆستای جادوو لە شاری هەبوون، هەرچەند دادگای پشکنینی بیرو باوەڕ لە ماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا هەزارو سێسەد جار ئەوانی بە تۆمەتی جۆراوجۆر مەحکووم کردبووو حەوت کەسیشی لە سەر لیژنەی دارێ سووتاندبوون. پزیشکێکی لاو لە سالامانکا برینی سارێژبۆوەی سییەرڤا ماریای هەڵدڕیو درێشەیەکی سووربۆوەی

وەك هەتوان پێوە نا تاكوو زووخاوی لە لەشیدا نەمێنێ. پزیشكێكی دیكە هەولێدا ئـەم كـارەی بـە پێوەنانی زێروو بە پشتیەوە ئەنجام بدا. دەلاكێك برینی كچۆڵەی بە میزی خۆی شـوردەوەو جـارێكی دیكەش فـەرمانی دا میزەكـەی بخواتـەوە. دوای دوو حـەوتووان كـچۆڵە لـە رۆژێدا دوو حـەمامی گیایی‌و حەمامێكی بە گیراوەیـەك بەسـەردا سـەپاو بـە خورادنـەوەی ئـاوی كـانزایی سروشـتی " ئوشنان"ە مەرگ هێنەرەكانی دیكە هەتا لێوی قەبرێیان برد.

تای هاتە خوارێ، بەڵام كەس نەی‌وێرا بڵێ مەترسیی هاری لە گۆڕێدا نەماوە. سـییەرڤا ماریـا هەستی دەكرد خەریكە بمرێ. لە سەرەتادا هەموو شتێكی بە غروورێكی لەشـكان نـەهاتووەوەو بـە قیمەتی گیانی دەكڕی، بەڵام دوای دوو حـەوتوو دەرمـانی بـێ ئاكـامی گـوێزینگی لاقـی درێـشە پێوەنراوی خۆی هەستی بە زوورانەوە دەكردو پێـستی وەك رەنگـی خـەردەلی لێ هـاتبوو. جێگـای هەتوانەكەی ئەستوور ببووو برینـی دەركردبـوو و میعـدەی وەك پارچـە گۆشـتێكی ئەسـتووری لێ هاتبوو. كچۆڵە هەموو شتێكی بەسەر هات. سەرەگێژە، لەرزو تا، فـێ، شـێتی، لاوازیـی ریخۆڵـەو دەنگ، لەبەر شیددەتی ئێش‌و تووڕەیی لەسەر عەرزی دەگریا. تەنانەت ئـازاترین جادووگـەرەكانیش كچۆڵەیان بە چارەنووس ئەسپاردو دڵنیا بوون یان شێتە یان جندار بووە. كاتێك ساگونتا بـە كلیلـی هوبرتووسەوە گەیشتێ، ماركیز بە تەواوی هومێدی لەدەست دا.

ئەمە كۆتایی ماجەرایەكە بوو. ساگونتا بەرگی خۆی داكەندو هەتوانی سوورپێستەكانی دەخـۆی هەڵسوو تاكوو دوایە بتوانێ لەشی خۆی دە لەشی كچۆڵەی هەڵسوێ. هەرچەند سییەرڤا ماریـا بـە تەواوی لاواز ببوو بەڵام بە دەست‌و پێ بەرگریی لە خۆی دەكرد. هەر بۆیە سـاگونتا ناچـار بـوو بـە توندو تیژی بەسەریدا زاڵ بێ. بێرناردا لە ژووری خۆیەوە هاواری شێتانەی ئەوی بیـست. تەقڵـەكوت گەیشتێ تا بزانێ چ رووی داوە. چاوی بە سییەرڤا ماریا كەوت كە لەسەر عـەرزی بەخۆیـدا دەداو ئاڵقەی بسكە رەنگ مزەكەی لەشی داپۆشیوەو ساگونتا بە گریانەوە نزای هوبێرتووسـی پـیرۆزی بـۆ دەخوێنێتەوە. بێرناردا هەردووكیانی بە بەندی نوێنان وەبەر شەللاقان دا. ئەوان لە پێشدا لەبەرامبەر هێرشی لەنەكاودا خۆیان خڕ كردەوەو خۆیان بە عەرزیدا دا. پاشان بێرنـاردا هـەتا پـشووی لێ بـڕا ئەوانی لە گۆشەیەكدا حاسێ كرد.

دۆن تورییبیۆ دی كازە رەسی ڤێرتۆدۆس سەرپەرسـتی ناوچـەی ئیـدارەی ئۆسـقۆف كـە لـە بەرامبەر وەزاڵەهاتنی خەڵكی سەبارەت بە دامـاوی‌و شـێتیی سـییەرڤا ماریـادا ئـۆقرەی لێ هەڵگیرابوو، نامەیەكی بانگ كردنی بە بێ هۆو شیكردنەوەو بەبێ رێكەوت‌و سەعاتی ئامـادە بوون بۆ ماركیز نارد، كە ئەمە بۆخۆی بە مانـای نائاسـیی بـوونی مەسـەلەكە بـوو. مـاركیز

ناروون بوونی نامەکەی وەبەرچاو نەگرت‌و هەر ئەو رۆژە بێ ئاگادارکردنەوی پێش وەخت لەو شوێنە ئامادە بوو.

ئۆسقۆف کاتێك ئەم کارەی پێ ئەسپێردرا کە مارکیز دەستی لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەڵگرتبوو و گۆشەگیر ببوو. هەر بۆیە زۆر بەکەمی یەکتریان دیبوو. هەروەها بەهۆی ناساغی لە مەینەتی دابوو سەبارەت بە دەنگی زل‌و بەژنی زەلامی، پێویستیی بە یارمەتی هەبوو بە هۆی رەبۆی درێژماوەوە ناخی بەتاڵ ببوو و کە پێی وابوو تاقی دەکرێتەو، لە زۆر پێشووی رەسمیدا بە بیری کەسدا نەدەهات ئامادە دەبێ ، وەدەر نەدەکەوت، و ئەگەر لە رێورەسمێکیشدا بەشدار بووایە، بەجۆریك قوونەدزەی دەدایە کە وردە وردە وەك بوونەوەرێکی وەبەرچاو نەهاتوو سەیری دەکرا.

مارکیز چەند جار ئۆسقۆفی دیتبوو و هەموو جارێش لە دوور راو لە نێو خەڵکدا. بەڵام یەکێك لە نزا مەعنەوییەکانی وەبیر دێتەوە کە ئەم ئۆسقۆفە خاوەن پلەوپایەیان لە عەبای ناییڤی‌و لەسەر کەژاوە دەگواستەوە. ئۆسقۆف لەبەر ئەوەی پیاوێکی بەخۆوە بووو لە بەرگی بەشکۆی کلێسا دا بوو، لە تێروانینی یەکەمدا وەك پیرێکی کەتە دەهاتە بەرچاو، بەڵام روخساری کۆسەی‌و جووڵەی دەم‌وچاوی‌و چاوەشینە سەیروسەمەرەکانی، سەرەرای تێپەرینی رۆژگار جوانیەکەی پاراستبوو. ئەو جوانیەی بە هێمنیەکەیەوە ئەوەندەی دیکەش زیادی دەکرد. ئۆسقۆف نووری جادوویی پاپێکی هەبوو و هەرکەس لە نزیکەوە ناسیبای، ئەو نوورەی بە رەنگدانەوەیەك لە خۆی دەزانی‌و بە جیددی رادەی دەسەڵاتی ئەوی بۆ دەردەکەوت.

ئەو کۆشکەی ئۆسقۆفی تێدا دەژیا، کۆنترین کۆشکی شاری بوو. ژووری گەورەگەورەی لە دوو نهۆمە نیوە وێرانەکەی هەبوون کە ئۆسقۆف تەنانەت کەڵکی لە نیوەشی وەرنەدەگرـ کۆشك لە پەنا کلێسای گشتی هەڵ کەوتبوو، رێیەکی هاوبەش کە بە پەنا دیوارێکی رەش دا دەسووڕایەوەو حەوشێکی وێران بە کانیەکەوە لە نێو دڕکەڵاندا. تەنانەت لەتە بەردەکان بەری ئاسۆی چاویان دەگرت‌و دەرگای سەرەکیی چوونە ژوور دارێکی رزیو بوو کە نیشانی کەمتر خەمی ئاوای بەسەر هێناوە.

مارکیز لە بەر دەرگای سەرەکی لە لایەن حزمەتکاری کلێساوە پێشوازیی لێکرا. ئەو خێرو بەخششی بە دەستپێوەگرتنەوە بە نێو تاقمێکی بچووکی سوالکەراندا دابەش کرد کە لە دەورو بەریدا کرنۆشیان بۆ دەبرد‌و کاتێك پێی نایە نێو کۆشکی فێنك‌و نیوە تاریك کە ناقووسەکانی کلێسای گشتی دەزرینگانەوە چرکە چرکەی بەرزی سەعات، چواری ئێوارێیان رادەگەیاند.

دەرگای چوونەژووری نێوێ ئەوەندە تاریك بوو كە مـاركیز بـێ ئـەوەی حزمـەتكاری كلێـسای ببینێ وەدوای دەكەوت، حزمەتكار دەبوا حیسابی بۆ هەموو هەنگاوەكانی خۆی كردبا تـاكوو نەوەكا دەنامرازەكانی پەیكەرسازیو وردە شتەكانی دیكەی سەر رێگا هەڵبنگوێ. لەو سـەری دالانەكە ژوورێكی بچووكی پێلاو داكەندنێ هەبوو كە چرایەك لە سەروەرا روونـاكی كردبـۆوە. خزمەتكار لەوێ راوەستاو بە ماركیزی گوت دانیشێو چاوەڕوان وەمێنێو بۆخـۆی بـە رێگـای دەرگایەكدا كە بە ژوورێكی دیكەوە بوو، ون بوو. ماركیز لە جێـی خـۆی راوەسـتا، و لەسـەر دیواری سەرەكی، وێنەی رەنگی رۆنیی سەربازێكی لە ئۆنیفۆرمی میوانداریی شایدا دیـت كـە ئالایەكی بەدەستە. كاتێـك پلاكـی برینجیـی سـەر چوارچـێوەی وێنەكـەی دۆزییـەوە ، بـۆی دەركەوت كە وێنەی سەردەمی گەنجەتیی ئۆسقۆفە.

حزمەتكار دەرگای كردەوەو داوای لێكرد بێتە ژوورێ. ماركیز لە جێی خۆی نـەبزووت بـۆ ئەوەی جارێكی دیكە ئۆسقۆفێ ببینێ، چل سـاڵ پیرتـر لـە دیـمەنی وێنەكـە، هەرچـەند رەبـۆ عەزیەتی دابووو گەرمای بەسەردا زاڵ ببوو، بەڵام بەرزترو خۆڕاگرتر لەوە بوو كە ئەو بـیری لێ دەركردەوە. ئارەقی بە سەرو دەموچاویدا دەهاتە خوارێ. زۆر بـە سـەنگینی لەسـەر كورسـیی جوولەی فیلیپینی دەجوولا و بە كەمی باوەشێنەكەی دەبزاوتو لەشی بۆ پێشەوە راگرتبـوو بـۆ ئەوەی باشتر بتوانێ هەناسە بدا. ئەو پێلاوی تەختەی گوندیی لە پێ دابـووو رووپۆشـێكی لـە كەتانی زوور لەبەردا بوو، ئەوەندە بە سابوونێ شۆرابوو كـە هێنـدێك شـوێنی دەبریـسكانەوە. ئینسان لەیەك روانیندا دەیزانی كە ئەوە بە راستی هەژارە. لە هـەمووی سەرنجراكێـشتر تـەنیا راستكۆیی چاوەكانی بوو كە بە خاڵی بەهێزی رووحیی ئەو دەژمێردرا. هەركە ماركیزی لە كن دەرگای دیت، لە جوولاندنی كورسییە رەحەتەكـەی دەسـتی هـەڵگرتو بـە رووخۆشـییەوە بـە باوەشێنەكەی ئاماژەی پێكردو گوتی:

"وەرە ژوورێ ئیگناچیۆ، ئێرە ماڵە خۆتە."

ماركیز دەستە ئارەقاوییەكانی خۆی بە پانتۆلكـەی سـڕیەوەو وەژوور كـەوت. لـە هـەوای ئازادداو لەبەر هەیوانێو لە ژێر پەردەیەك لە گوڵە فینجانیە زەردەكانو گیایەكی هەڵاوەسراوو بە بورجی كلێساوە كە دەجوولا سەیری سەربانی سـووری مـاڵی گـەورانو بـاڵ لێـدانی كـۆترە خەواڵووو گەرما لێدراوەكانی سەر دیوارو سەنگەری عەسكەرانی كرد، كە لە بەرامبەر ئاسمانی شووشەییو دەریای گەرمدا لەسـەر پـێ راوەسـتابوون. ئۆسـقۆف بـە ئەنقەسـت دەسـتی وەك سەربازەكانی خۆی راداشتو ماركیز ئەنگوستیلەكەی ماچ كرد.

نۆسقۆف لەبەر رەبۆ بەزەحمەت هەناسەی هەڵدەکێشاو هەناسەکەی دەنگی لەگەڵ بوو. رستەکانی نێوە نێوە بە ناڵەو کۆخەی کورت کورت دەپچڕان. بەڵام هیچیان لەپاراویی قسەکانی کەم نەدەکردەوە. خێرا، بێ ئەوەی پێویست بێ خەریکی لێکدانەوەی وردەرووداوەکانی رۆژانە بوو. مارکیز کە لەبەرامبەری دانیشتبوو ئەو رەفتارە ئارامبەخشەی زۆر بە دڵ بوو کە بابەتەکان بە پرنێوەڕۆکی شی دەکاتەوە، بە چەشنێك کە هەردووکیان بە زرینگانەوەی زەنگی سەعات پێنجی پاشنێوەڕۆیە وەخۆ هاتنەوە. بابەتەکە کەمتر باس لە دەنگی زەنگەکە بوو، زیاتر باس لە رووناکایی کەم و ئاڵۆزی پاشنێوەڕۆیە بوو کە ئاسمانی داپۆشراو بە کۆترە سەرگەردانەکان پێکیان هێنابوو.

نۆسقۆفەکەگوتی:" کارەساتە. هەموو سەعاتێك زرینگانەوەی دەنگی ناقووس وەك بوومەلەرزە دەرروونم دەهەژێنێ."

مارکیز سەری لەم قسەیە سوڕ ما، چونکە کاتێك زەنگی سەعات چوار لێی دا ئەویش راست لەو فکرە دابوو. ئەم وێککەوتنە لە روانگەی نۆسقۆفە شتێکی زۆر سروشتی بوو. گوتی:" فکر ئی هیچ کەس نیە." پاشان هێندێك بازنەی لە نێو یەکدا کێشانەوەو قامکی بەرەو حەوا راداشتو گوتی:

" ئەتۆ وەك فریشتەیەك لە فەزا دا راوەستاوی."

راهیبەیەك میوانداریی کردو تونگەیەکی پڕ لە لەتکە میوەی جۆراوجۆر لە نێو شەڕابی خەست دا لەگەڵ قاپێك ئاوی گەرم هێنا کە بۆنی دەرمانێ ژوورەکەی پڕ کرد. نۆسقۆف بە چاوی بەسراوەوە هەڵمەکەی هەڵمژی، کاتێك هاتەوە سەر دۆخی پێشووی، بوو بە کەسێکی دیکەو بوو بە پیاوێکی بەهێزو زاڵ بەسەرخۆیدا.

بە مارکیزی گوت:" ئێمە تۆمان بانگ کردە ئێرە چونکە دەزانین پێویستیت بە خوایە، بەڵام ناتەوێ قبوولی بکەی." دەنگی نۆسقۆف ئیدی زرنگانەوەی ئۆرگی نەبوو و چاوەکانی هاتنە سەر باری شەفافیەتی دنیایی. مارکیز یەکبین نیوەی پەرداخەکەی هەڵ دا تاکوو لەوی دوا نەکەوێ. وەك چەك کرابێ‌و بە لارەملییەوە گوتی:" جەنابت باش دەزانی نەگبەتییەکی گەورە کە دەتوانێ مرۆڤی بوەستێنێ ئازارم دەدا، هەربۆیە دەستم لە ئیمانم هەڵگرت."

نۆسقۆف بێ ئەوەی سەری سوڕ بمێنێ وەڵامی دایەوە:" ئێمە ئەوەی دەزانین کوڕم، چۆن دەکرێ نەزانین!"

ئەو قسانەی بە خۆشحالییەکی تایبەتییەوە دەکردن، چونکە لە تەمەنی بیست ساڵیدا کاتێك ئالأهەڵگری پاشا لە مەراکیش بوو، لە نێو هات‌و هاواری کوشت‌و کوشتاردا ئیمانی خۆی لەدەست دابوو. ئۆسقۆف گوتی:" ئەمە جۆرێك لە تێگەیشتنی راستیی لە ئەکاو بوو و ئیدی خوایەك نەبوو." بە ترسێکی تەواوەوە ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ عیبادەت‌و تۆبە لە کۆتاییدا گوتی:

" هەتا ئەو کاتەی خوا بەزەیی پێمدا هات‌و رێگەی دەعوەتی پێ نیشان دام. گرنگ ئەوە نیە ئەتۆ باوەڕت نیە، بەڵکوو گرنگ ئەوەیە خوا هەروا باوەڕی بە تۆ هەیە. گومان لەوەدا نیە، چونکە ئەو بە سەرنجی بێسنووری خۆی رووناکیمان پێ دەبەخشێ‌و چاکەو ئارامیمان پێ دەدا."

مارکیز گوتی:" دەمەویست لە ئارمیی تەواودا بەسەر ئەگبەتیی خۆمدا زاڵ بم."

ئۆسقۆف گوتی:" بەڵام سەرنەکەوتی. ئەمە رازێکی سەیرە کە کچە بێچارەکەت بە هەڵلەرزین‌و بە شڵەژاوی لەسەر عەرزی جینگڵان دەدا و لە رووی ئەفامییەوە لە بەرامبەر وێنەی پیرۆزدا دەوەڕێ. ئەمانە نیشانەی حاشاهەڵنەگری کاریگەریی بێئەم لاوئەم لای جندووکان نین؟"

مارکیز ترسابوو.

" مەبەستت لەم قسانە چیە؟"

ئۆسقۆف گوتی:" لە پێڕستی زۆربەی جندووکەکاندا وا هاتوە کە ئەمانە لە شێوەی ئەخۆشییەکی ناشیریندا دێنە نێو قالبی مرۆڤی پاکەوەو ئەگەر جندووکە جارێك بێتە نێو رووحی کەسێکەوە هیچ هێزێك ناتوانێ دەر بکا."

مارکیز مەترسیی پزیشکیی کەستنی سەگی بۆ باس دەکرد، بەڵام ئۆسقۆف دیسان بۆ دیفاع لە بۆچوونەکانی خۆی قسەی هەر هەبوو.

ئۆسقۆف شتێکی لێ پرسی کە بێگومان بۆخۆی بە باشی دەزانی:

" دەزانی ئابرێ ئۆنچیکۆ کێیە؟"

مارکیز گوتی:" ئەو یەکەم پزیشك بوو کە کچەکەمانی پشکنی."

ئۆسقۆف وەڵامی دایەوە:" دەمەویست ئەمەم لە زمانی خۆتەوە گوێ لیبێ."

ئەو، ئەو ناقووسەی لیدا کە لە مەودایەکی دوورترەوە هەڵکەوتبوو. یەکدابەدوو وەك جندووکەیەك لە قوتوو دەرپەڕیبێ، قەشەیەکی سی ساڵە لەوێ ئامادە بوو. ئۆسقۆف ئەوەی بە ناوی باوکە کایەتانۆ دیلاڤرا ناساندو هیچی دیکەی نەگوت‌و داوای لێکرد دانیشێ. باوکە

عەبایەکی درێژی مالێی تایبەت بە رووحانیە کاسولیکەکانی لەبەردا بوو کە لە رۆژانی گەرمدا لەبەر دەکراو پێڵاوی وەك پێلاوە تەختەییەکانی نۆسقۆفی لەپێدا بوو. رەنگ زەردو نوورانی بوو، چاوەکانی گەش‌و پرچی وەك پەڕی قشقەڵەی بوون‌و پڕێسکەیەکی کەتانیی سپیی لە نێوچاوانێ بەستبوو. هەناسەبڕکێ‌و دەستە گەرمەکانی ئیزنیان پێ نەدەدا تاکوو لە ریزی مرۆڤە بەختەوەرەکاندا سەیری بکرێ.

نۆسقۆف لێی پرسی:" ئێمە لە بارەی ئابرێ نۆنچیکۆوە چ دەزانین؟"

لە کاتێکدا ناوی پیت بە پیت دەهێنا گوتی:" ئابرێ نۆنچیکۆ دی سا پێرارێرا کائۆ." و خێرا رووی کردە مارکیزو گوتی:" بەڕێز مارکیز، سەرنجت داوەتێ لەقەبی پێش کۆتایی ئەو لە زمانی پورتوگالیدا بە واتای سەگە؟"

دیلاڤرا درێژەی پێدا کە بە وردی نازانێ ناوە راستییەکەی چیە. بەپێی بەڵگەکانی دایرەی کلێسای پیرۆز ئەو جوولەکەیەکی پورتوگالییە کە لە نیمچە دورگەی ئیبری وەدەر نراوە لێرە لە ژێر پشتیوانیی شارەداری قەدرناس دایە، کە گونە قۆڕە یەك کیلۆیەکەی بە ناوە پالاوتەکانی توریاکۆ چاك کردۆتەوە. باوکە باسی دەرمانە جادووییەکانی ئابرێ نۆنچیکۆ، خۆبەزلزانییەکەی کە پێشگۆیی مەرگ دەکا، ئەگەری حەزی وی لە نێربازی، قسە رۆشنگەرەکانی‌و ژیانی بێ خوایی ئەو کرد. تەنیا لۆمەیەکی راست کە لە دژی وی هەبوو، ئەوە بوو کە ژیانێکی دووبارەی بە پینەچییەکی خەلکی گەتسمانی بەخشیبۆوە. شاهیدە جیددییەکان دەیان گوت ئەو پیاوە کفن کرابوو لە نێو تابووت دابوو کە ئابرێ نۆنچیکۆ ئەمری پێکرد قیت بێتەوە. بە خۆشییەوە کابرا دیسان ژیایەوەو بۆخۆی لە بەرامبەر کلێسای پیرۆزدا تەنییدی کرد کە تەنانەت یەك ساتیش هۆشی خۆی لەدەست نەداوە. دیلاڤرا گوتی:" و بەم جۆرە ئەوەی لە سووتان لەسەر لیژنەی داران نەجات دا." سەرەنجام باسی ئەسپەکەی کرد کە لە کوێستانی سان لازارۆ تۆپیوەو لە عەرزی پیرۆزدا بە خاك ئەسپێردراوە.

مارکیز شتەکەی ئاوا باس کرد:" ئەو ئەسپەکەی بەقەد مرۆڤێك خۆش دەویست."

دیلاڤرا گوتی:" ئەوە سووکایەتی بە بیروباوەڕی ئێمەیە، بەڕێز مارکیز. ئەسپی سەد ساڵە مەخلوقی خوای نین."

مارکیز لەوەی کە لە وتووێژێکی تایبەتییەوە سەری لە ئارشیڤی ئیدارەی کلێسا دەرهێنابوو، نیگەران بوو. ویستی بەرگرییەکی بەپەلە بکا " ئابرێ نۆنچیکۆ کەسێکی زمان شڕە بەڵام خاکەڕایە، پێم وایە دەبێ لەوێوە تا لە دین وەرگەڕان مەودایەکی گەلێك درێژ هەبێ."

ئەگەر ئۆسقۆف باسەکەی سەرلەنوێ نەهێنابایەوە جێی خۆی باسەکە تاڵو دووردرێژ دەبۆوە.

ئەو گوتی:" ئێستا پزیشکەکان چ دەڵێن با بڵێن، هاری زەمینە بۆ یەکێك لە پێرستە زۆرەکانی شەڕێکی دوژمنانە لەگەڵ مرۆڤ خۆش دەکا."

مارکیز دە قسەکەی نەگەیشت. پێناسەی ئۆسقۆف ئەوەندە بە خەفەتەوە بوو کە وەك شانۆی چارەنووس لە ئاگریچکی هەمیشەییدا دەچوو.

ئۆسقۆف هەروەها گوتی:"بە خۆشییەوە خوا ئامرازێکی لەبەر دەستی ئێمە ناوە تاکوو رووحی منداڵەکەتی پێ رزگار بکەین، تەنانەت ئەگەر جیسمیشی بە شێوەیەکی قەرەبوونەکراو لەدەست بچێ."

شەو بە زۆرە ملی خۆی بەسەر جیهاندا دەسەپێنێ، مارکیز یەکەم ئەستێرەی لە ئاسمانی وەحشیدا دیت. کچەکەی بە تەنیا لە ماڵێکی وێراندا هێنایە بەرچاوی خۆی کە چۆن چارەسەری بە هەڵەی لاقی، دەبووە هۆی ئێشو ئازاری. بە خاکەڕاییەکی سروشتییەوە پرسی:

" دەبێ چ بکەم؟"

ئۆسقۆف خاڵ بەخاڵ بۆی باس کرد. دەسەڵاتی پێ دا لە هەر هەنگاوێکیدا بەتایبەتی لە پەرستگەی سانت کلارا، ناوی وی بێنێ، ئەو شوێنەی کە هەرچی زووتر دەبێ کچەی تەسلیم بکا. لە کۆتاییدا گوتی:

" کچەکەت بە مە بسپێرە، کارەکانی دیکە خوا بۆخۆی دەیانکا."

مارکیز کاتێك ئەوێی جێ دەهێشت غەمگینتر لە کاتی هاتنێی بوو. لە پەنجەرەی کالیسکەکەیەوە، شەقامو ئەو منداڵە بێ هومێدانەی دەدیتن کە لە گۆلی پڕ لە زبڵوزاڵدا لە کن دالاشان دە ناوێ هەڵدەهاتن. کاتێك لە پێچی شەقامێ ردت بوون وەك هەموو جاران دەریای لە جێی خۆی دیتو نائارامی سواری سەری بوو.

لەگەڵ بیستنی دەنگی ناقووسی دوعا، پێی نایە خانووی رەش. بۆ یەکەم جار پاش مەرگی دونا ئولالا بە دەنگی بەرز نزای کرد: فریشتەی خوا پەیامی بۆ حەزرەتی مەریەم هێناوە.

دەنگی تەلەکانی چەنگی ئیتالیایی لە تاریکایی ماڵەکەدا دەزرینگایەوە، وەك بڵێی لە بنی گۆمێ ڕا بێت. مارکیز وەدوای دەنگەکەی کەوتو گەیشتە ژووری کچەکەی. کچۆڵە لەوێ بوو، رووپۆشێکی سپیی لەبەردا بوو و لەسەر کورسی بەرامبەر بە کۆمێدی مێزی ئارایش دانیشتبوو. ئاڵقەی بسکی بڵاوی دەگەیشتە سەر عەرزیو پارچە مۆسیقایەکی سادەی پرۆڤە

دەکرد کە لەوی فێر ببوو. مارکیز باوەڕی نەدەکرد ئەمە هەر ئەو بوونەوەرەیە کە کاتێک نیوەڕۆیە بەجێی هێشت بەهۆی کەمترخەمی لە دەواو دەرمانی نابەجێ کۆڵەوار ببوو. سییەرڤا ماریا بە هاتنە ژووری ئەوی زانی، دەستی لە لێدان کێشایەوەو دیسان نوقمی ئێش‌و ژان بۆوە.

هەتا بەیانی لەپەنا کچەکەی مایەوە. بە ناشارەزایی وەك کۆلکە باوکێکی پیرۆز، لە ژووری خەوێ بۆ عیبادەت یارمەتیی کچەکەی دا. کراسی خەوی کچەکەی بەراوەژوو لەبەر کرد کە کچە دەبوا دیسان داینیی‌و بە دیوەکەی دیکەدا دەبەری بکاتەوە. ئەوە یەکەم جار بوو کە کچەکەی بە رووتی دیت‌و لە دیتنی ئێسکی پەلاسووەکانی بن پێستی و مەمکی کە خەریك بوو دەهاتن‌و بەگەندە موویەك داپۆشرابوون، لە عەزابدا بوو. دەرووبەری گوێزینگی لاقە ئەستوور بووەکەی، داغ کرابوو. کاتێك بۆ نزا یارمەتیی کچەکەی دەدا بە ناهو ناڵەیەکی تەقریبەن بێدەنگ غەمی خۆی دەر دەبڕی‌و لەبەرچاوی سییەرڤا دەتگوت باوکی لە کاتی مردنیدا یارمەتیی دەدا.

لەو کاتەوە کە ئیمانی خۆی لەدەست دا بوو، بۆ یەکەم جار هێزێکی بۆ نزا لە خۆی دا شك برد. چووە ژووری چووکەی نزا لە ماڵیدا بە هەموو توانای خۆیەوە هەوڵی دا، ئەو خوایەی کە دەستی لێ هەڵگرتبوو، وەدەستی بێنێتەوە، بەڵام بێ ئاکام بوو. بێ ئیمانی هێزی بەرگریی زیاتری هەیە لەچاو ئیمان، چونکە لەسەر بنەمای عەقڵە. لە فێنکیی سەرەتای ڕۆژدا، چەند جار گوێی لە دەنگی کۆخەی کچەکەی بووو چووە ژووری خەوتنی. کاتێك تێدەپەڕی دیتی دەرگای ژوری بێرناردا نیوە کراوەیە. هەستی بە ناڕەحەتی کردو ویستی ترسی خۆی کەم بکاتەوە، بۆیە دەرگای ژوورەکەی کردەوە، بێرناردا بەرەو زگ لەسەر عەرزی خەوتبووو زۆر سەیر دەیمرخاند. مارکیز دەستی بە دەزگیرەی دەرگاوە گرت‌و راوەستاو هەڵی نەستاند. لە حاڵ‌و هەوای خۆیدا گوتی:" بە قوربانی کچۆڵەی بی." و خێرا راستی کردەوە:" ژیانە قوڕەکەی هەردووکمان بە قوربانی کچۆڵەی بێ، لەعەنەت لە شەیتانێ."

کچۆڵە لە خەوێدا بوو. مارکیز دیتی ماندووو بێ جووڵە لەسەر تەختێ کەوتوەو لە خۆی پرسی، داخوا پێی خۆشە کچەکەی بمرێ، یان تەسلیمی ئەشکەنجەی نەخۆشیی هاریی بکا. پەردەی دەوری تەختەکەی ڕێك‌وپێك کرد تاکوو شەمشەمە کوێرەکان خوێنی نەمژن، دای‌پۆشی بۆ ئەوە چیدی نەکۆخێ‌و لە پەنا تەختی بە ویژدانێکی ئاسوودەو نوێوە، ئاگای لە کچەکەی بوو. دەیویست کچەکەی ئەوەندە خۆش بوێ کە لە دنیایەدا کەسی ئەوەندە خۆش نەویستبێ. بۆیە بێ ئەوەی راوێژی لەگەڵ خواو خەڵکی دیکە بکا بڕیاری ژیانی خۆی دا. سەعات چواری بەیانی کاتێك سییەرڤا ماریا چاوی کردنەوە باوکی دیت کە لەسەر تەختی خەوەکەی دانیشتوە.

مارکیز گوتی:" کاتی رۆیشتنه."

کچۆڵه بێ ئەوەی زۆری لەسەر بڕوا هەستا. مارکیز یارمەتیی دا تاکوو بەرگێکی گونجاو لەبەر بکا. لەنێو سندووقێدا جووتێك سەرپایی مخمەریی دۆزییەوە تاکوو پانێی چەرمیی نێو چەکمەکەی گوێزینگی ئازار نەدا، و بێ ئەوەی زۆر بگەڕێ، بەرگی میوانداریی دایکی ئەی سەردەمی گەنجەتییەکەی، دۆزییەوە. ئەمەی هەر لەو کاتەوە پێچابۆوە وێدەچوو دایکی لە جارێکی زیاتر لە بەری نەکردبێ. تەقریبەن مارکیز دوای سەد ساڵان بەرمووړووی سانتە ریا و گەردن بەندی زینەتیی غوسڵی تەعمیدی لە بەرۆکی سییەرڤا ماریا دا. بەرگەکەی هێندێك بۆ تەسك بوو و تا رادەیەك کۆنیی پێوە دیار بوو. کڵاوێکیشی لەسەرنا کە ئەویشی هەر لە سندووقەکەدا دیتبۆوە کە قردێلە رەنگاورەنگەکەی لەگەڵ بەرگەکەی دەگونجا و زۆر بە باشی لەگەڵی دەهاتەوە. سەرەنجام جانتایەکی چووکەی دەرێنا و کراسێکی خەوو شانەیەکی دەنك ورد کە بتوانێ لە کاتی شانەکردندا رشك‌و ئەسپێیان لەپرچی بکاتەوە لەگەڵ بەرماڵێکی چووکەی دایەگەورەی تێ هاویشت کە قەراغەکانی زێڕکفت کرابوو لەبوخچەیەکی سەدەفیی نابوو.

دوایین یەك شەممەی بەر لە جێژنی پاك بوو. مارکیز، سییەرڤا ماریای لەگەڵ خۆی بردە نزای سەعات پێنجی بەیانی و کچۆڵە لە رووی دڵپاکییەوە چڵە زەیتوونێکی تێکەوە پێچراوی وەرگرت بێ ئەوەی بزانێ بۆ. پاش کلێسا لەنێو کالیسکەدا زانی تاو هەڵاتوە. مارکیز لە بەشی پشتەوەی کالیسکەدا جانتا چووکەکەی لەسەر چۆکی دانابوو و سییەرڤا ماریا بێ ئەوەی کەمترین دڵەڕاوکێی هەبێ لەسەر کورسی لە بەرامبەری وی دانیشتبوو و لە پەنجەرەوە سەیری دوایین شەقامەکانی تێپەڕینی تەمەنی دوازدە ساڵانەی خۆی دەکرد.

لەم بەرەبەیانیەدا لە بەرگی یوحەننای شێتدا و کڵاوی سۆزانیەکان لەسەر، بۆ کوێیان دەبرد، تۆزقاڵێك بیری لێ نەکردەوە. مارکیز پاش وردبوونەوەیەکی دوورو درێژ پرسی:

" دەزانی خوا کێیە؟"

کچۆڵە شانی هەڵ تەکاند. لە ئاسۆی دوورەدەست بروسك‌و گرمەی هەوران بوو. ئاسمان لێڵ بووو دەریا دەخرۆشا. کاتێك بە گۆشەی شەقامێدا وەرسووڕانەوە پەرستگەی سانتاکلارا لە بەرامبەریان دەرکەوت. سپی‌و بە تەنیا، سێ نهۆم‌و پەنجەرەی بە لاولاوەی شینەوە کە لە بەرامبەر یەکێکیاندا هێندێك زبڵ لە قەراغ دەریا بەرچاو دەکەوت. مارکیز بە قامکی نیشاڕەوە خانووەکەی نیشان داو گوتی:" هۆوەیە." پاشان بۆلای چەپ وەرسووڕاو گوتی:" لەو

پەنجەرەیەڕا هەمیشە دەتوانی سەیری دەریا بکەی." لەبەر ئەوەی کچە سەیری ئەویی نەدەکرد، بە کورتی بۆی باس کرد کە دەبێ ئەوی بە چارەنووس بسپێرێ:

" چەند رۆژێکی لە کن خوشکانی پرستگەی سانتاکلارا بەسەر دەبەی."

یەك شەممەی بەر جێژنی پاك داهات. لەبەر دەرگای چوونە ژووریّ سوالکەرەکان زیاتر لە هەمیشە بە دەنگو هەرایەکی زۆرەوە راوەستابوون. چەند گولێك لەسەر پاشماوەی شیرینییەکان پێك هەلّپرژانو دەستیان درێژ کردو روویان دەمارکیزی کرد. ئەو بە غەمو خەفەتەوە خێراتەکەی دابەش کرد. تا ئەو جێیەی بەشی کرد سەرو سیککەیەکی پێ دان. ژنی فەراشەکە ئەوی لە بەرگی رەشپۆشی دا و کچەی لە بەرگی شازادەیەکدا دیت. رێگەیەکی کردەوە تاکوو پێشوازییان لیبکا. ژنە فەراشەکە سەبارەت بە رەفتارەکەی گومانی لە قسەکانی نەکرد. ئەو هۆی هاتنی کچۆلکەی زانیو کلاوەکەی لەسەر لابردو گوتی:" کلاو قەدەغەیە."

سییەرڤا کلاوەکەی بە دەستەوە گرت. مارکیز دەیەویست جانتا چووکەکەی بداتێ، بەلام ژنە فەراشەکە نەیهێشت:

" کچەکەت لێرە لە هیچی کەم نابێ."

لەبەر ئەوەی پرچی سییەرڤا باش نەبەسرابوو، کرایەوەو تەقریبەن هەتا سەر عەرزی بلاو بۆوە. ژنە قەراشەکە باوەڕی نەدەکردکە ئی خۆی بێ، مارکیز هەولّی دا پرچەکانی دیسان رێك بخاتەوە. کچە پالّی بە باوکی وەناو بەبێ یارمەتی پرچی خۆی ئەوەندە بە لێزانییەوە کۆکردەوە کە ژنە قەراش سەری سوڕ ما.

ژنە قەراش گوتی:" دەبێ پرچی بۆ کورت بکەینەوە."

مارکیز وەلامی دایەوە:" ئەوە پێوەندیی بە نەزرێکەوە هەیە کە بۆ خاتوونێکی کچ کردوومانەو هەتا رۆژی بەشوودان وەك خۆی دەمێنێتەوە."

ژنە قەراشەکە لە بەرامبەر ئەو هۆیەدا سەری کڕنۆشی دانەواند. بێ ئەوەی دەرفەتێك بۆ مالاوایی بێلێتەوە دەستی کچۆلەی گرتو لە دەرگای چوونە ژووری قەرەبالغەوە بردیە ژوورێ. لەبەر ئەوەی لە کاتی رۆیشتندا گوێزینگی سییەرڤا ماریا دێشا، لینگە سەرپایە چەپەکەی دەرێنا. مارکیز دیتی کە کچۆلە بە شەلە شەلو سەرپایەی دەستیەوە دوور دەکەوێتەوە. ئەو لە خۆڕاو چاوەڕێ بوو بەلکوو خوا بکا لە رووی روحمو بەزەییەوە ئاوڕێکی لێ بداتەوە. دوایین بیرەوەری کە بۆی مایەوە، ئەوە بوو کە کچۆلە چۆن لاقە نەخۆشەکەی بەدوای خۆی دا دەکێشاو لەوسەری دالانی باغی پەرستگە، لە سەر رێگای زیندەبەچالەکان لەبەرچاوانی ون بوو.

# ٣

پەرستگەی سانتاکلارا بینایەکی چوارگۆشە بوو لە قەراغ دەریا. پەنجەرەی بەقەد یەکی گەلێك هەبوون، بە سێ نهۆم دانرابوو و ڕێگەیەکی هاتوچۆ بە دەوری باغچەی گیای خۆڕسکدا دەسووڕایەوە. بارێکەرێیەکی سەنگچن بە نێو دەوەنی مۆزو کارووشە خۆڕسکەکانو دارخورمایەکی باریك کە بە دوای هەتاودا هەتا شانشین هەڵیدابوو هەروەها دارێکی ئەستووردا تێ دەپەڕی کە ڤانیلی بە لقەکانیەوە هەڵچووبونو گوڵی ئۆرکیدەی پێوە هەڵاوەسرابوونو تووتییەکان لەو چڵ بۆ ئەوچڵ لەسەری هەڵدەفڕین.

باغچە، پەرستگەی دابەش کردبووە سەر دوو ڕێگەی بینایەکە. لای ڕاست، بینای سێ نهۆمیی زیندە بەچاڵەکانی لێ بوو کە بە دەگمەن بەهۆی لرفەی شەپۆلەکانی دەریا لە سەرەولێژیی لێوارو زرینگەی سەعاتەکانی نزا لە عەزاب دا دەبوون. ئەم ڕێگەیە بەهۆی دەرگایەکی ژوورەوە دەچۆوە سەر ژوورێکی چووکەی دوعا تاکوو خوشکانی دەیر ناچار نەبن لەبەر کۆرس بە ئاشکرا بە هۆڵی سەرەکیی کلێسادا رابرن کە جێیەك بوو نزای ئاییینییان لێڕا دەبیستو دەگوتو، لە پشت ئەردەکانە سەیریان دەکرد بەڵام کەس نەیدەتوانی ئەوان ببینێ.

بەرهەمێکی هونەریی سەر تەختە، باشەکانی رووپۆشی سندووقەکان کە هەموو ژوورەکانی پەرستگەی دەڕازاندەوە، بەرهەمی خاوەن پیشەیەکی ئیسپانیایی بوو کە نیوەی تەمەنی بۆ دروستکردنی ئەمانە تەرخان کردبوو بۆ ئەوەی مافی هەبێ پاش مەرگی لە دیواری مێحرابێدا بیەنێژن. ئێستا ئەو نزیکەی دووسەد ساڵ بوو لەگەڵ راهیبەکانو ئۆسقۆفەکانو بژاردەکانی دیکە، لە پشت رووپۆشی مەڕمەڕدا پان ببۆوە.

کاتێك سییەرڤا ماریا هاتە پەرستگە، هەشتاو دوو کەس لە راهیبە دەیر نشینە ئیسپانیاییەکانو تەواوی هاوالەکانو خزمەتکارەکانیانو سیو شەش کەس لە ژنانی کۆچەریی کرئوولی سەر بە بنەماڵە گەورەکانی جێگری وڵاتی پاشا لەوێ بوون.

پاش ئەوەی مەدحی هەژاریو بێدەنگیو پاکییان دەکرد، تەنیا ڕێگای پێوەندی لەگەڵ دنیای دەرەوەو ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ میوانە دەگمەنەکان بریتی بوو لە ئاوەدەستی پشت نەردە دارینەکان، ئەویش تەنیا بە دەنگو بەس، دیارە ژووری هیچ ڕووناکییەکیشی نەبوو. ئاوەدەست لە پەنا دەربیجەی هەوا هەڵکەوتبوو کەلك لێوەرگرتنی سنووردارو بە پێی ڕێو شوێنی دیاریکراو بووو هەمیشەش ڕاهیبەیەك بە نهێنی گوێی ڕادەگرت.

لای چەپی باغەکە ژووری دەرس گوتنەوەی لێ بوونو کارگە جۆراوجۆرەکان پڕ بوون لە شاگردو مامۆستا. هەر لەوێ خانووی پایە نزمەکان لەگەڵ مەتبەخێکی زۆر گەورە و شوێنێك بۆ سووتاندنی ئاوردوو، مێزی لەسەرکوشتنەوەو تەندوورێکی گەورەی لێ بوو. لە پشت وی، حەسارێکی زەلکاوی لێ بوو کە بەهۆی ئاوەڕۆی شووردنی بەردەوامەوە دروست ببو و چەند ژنو مێردی سەر بە بنەماڵەی کۆیلەکان لە وێ پێکەوە دەژیان، ئینجا دەگەیشتە تەویلەکان. ڕاوگەیەکی بزنان، کۆختی بە پەروەرژینی بەرازان، کەندوو و باغچەی سەوزیو ئەوەی کە بۆ ژیان باشو پێویست بوو بەخێو دەکرانو دەچێنران.

لەوبەڕی گۆشەی باغێ، لە دوورترین شوێنی مومکینی گۆشەی باغێ خانوویەکی پشت گوێخراوی بە تەنیا هەبوو کە شێستو هەشت ساڵ پێشتر هەمووی لەخزمەت دادگای پشکنینی بیروباوەڕدا بووو ئێستاش بۆ ڕاهیبە گومڕایەکانی کلارسیتی کەلکی لێوەردەگیرا. لە دوایین ژووری تاکەکەسیی ئەم خانووە لەبیرکراوەدا، سییەرڤا ماریایان بۆ ماوەی نەودو سێ ڕۆژان دوای ئەوەی سەگی هار گەستیو بێ ئەوەی چووکەترین نیشانەی هاریی لێ وەدەرکەوتبێ، حەبس کرد.

ئەو ژنە فەڕاشەی دەستی کچۆڵەکەی گرتبوو، لەوسەری داڵانێ تووشی ڕاهیبەیەکی شاگرد بوو کە دەچووە مەتبەخێ. داوای لێکرد سییەرڤا ماریای بەرێتە کن ڕاهیبەکان. ڕاهیبە شاگردەکە فکری کردەوە کە کارێکی ئاقڵانە نیە کچێکی بەو ناسکیو تەڕپۆشییە بەرێتە نێو دەنگە دەنگی مەتبەخ، بۆیە لەسەر کورسیی بەردینی باغ دای نیشاند تاکوو پاشان بگەڕێتەوە لەگەڵخۆی بەرێ، بەڵام کاتێ گەڕایەوە سییەرڤا ماریای لەبیر چوو.

دوو ڕاهیبەی شاگرد کە پاشان بەوێدا ڕابردن ملوانکەو ئەنگوستیلەی سییەرڤا ماریایان پێ جوان بووو لە کچۆڵەیان پرسی ئەتۆ کێی. کچۆڵە وەڵامێکی نەدانەوە. ئەوان لێیان پرسی دەتوانی بەئیسپانیایی قسان بکەی. کچە بە جۆرێك بوو دەتگوت قسان لەگەڵ مردوویەکی دەکەن.

ئەو شاگردەی گەنجتر بوو گوتی:" کەڕو لاڵە."

ئەوەی دی گوتی:" و یان لە ئاسمانەوە هاتوە."

شاگردە گەنجەکە بە جۆریکی هەڵس‌وکەوت لەگەڵ کرد کە وابزانە سییەرڤا ماریا بەسەر پێنج هەستەکەی دا زاڵ نیە. پرچی کچۆڵەی کە لە پشتەوەڕا بەستبووی، کردەوەو بە بەستان پێوای‌و گوتی:" نزیکەی چوار بست." دڵنیا بوو لەوەی کە سییەرڤا ماریا گوێی لێنابێ. پاشان دەستی کرد بە هۆنینەوەی پرچی کە کچۆڵە بە چاو هەڕەشەی لێکرد. راهیبە شاگردەکە درێژەی پێدا زمانی لێ دەرێناو بە سییەرڤا ماریای گوت:" چاوەکانت شەیتانیین."

ئەو شاگردەی گەنجتر بوو بێ ئەوەی لەگەڵ بەربەرەکانێیەك بەرەوڕوو بێ، یەکێك لە ئەنگوستیلەکانی دەرهێنا، بەڵام کاتێك شاگردەکەی دیکە ویستی ملوانکەکەی لیبکاتەوە، سییەرڤا ماریا وەکوو مارێك وەرسووڕاو خێرا دەستی پێکاو گەستی. شاگردە لەوێ هەڵات تاکوو خوێنی دەستی بشواتەوە.

کاتێك ئاوازی راهیبە شاگردە نوێیەکان بیسرا، سییەرڤا ماریا لە جێی خۆی هەستا تاکوو لە حەوزەکە ئاوێ بخواتەوە، بە ترسەوە بێ ئەوەی ئاوێ بخواتەوە بەرەو کورسییەکە گەڕایەو، بەڵام کاتی زانی ئەوە ئاوازی راهیبەکانە دیسان قیت بۆوە. بە جووڵەی لێزانانەی دەستی، گەڵارزیوەکانی لا داو بێ ئەوەی ترسێکی لە تۆوی جۆرجانەوەران بە دڵ دابێ لە ئاوی حەوزەکەی خواردەوە تاکوو تینوویەتیی بشکێ. پاشان بۆ میزکردنێ لە پشت دارێ هەڵتروشکاو دارێکی بەدەستەوە گرت تاکوو بتوانێ لە بەرامبەر گیانلەری مزاحیم‌و پیاوی حیزدا، راست بەو جۆرەی کە دومینگا ئادڤێنتۆ فێری کردبوو، بەرگری لە خۆی بکا.

کەمێك دواتر دوو کۆیلەی رەش نزیك بوونەوەو ملوانکەی سانتە ریایی ئەویان ناسیەوە. بە زمانی یورووبایی دەستیان کرد بە قسان لەگەڵی. کچە بە خۆشحاڵییەوە هەر بەو زمانەی وەڵامی دانەوە. چونکە کەس نەیدەزانی بۆچی لەوێ دانیشتوە، کۆیلەکان لەگەڵ خۆیاندا بردیانە مەتبەخی پڕ لە هەراو هوریاو خزمەتکارەکان بە خۆشحاڵییەوە پێشوازیان لێ کرد. یەکێکیان بە برینی سەر گوێزینگیی زانی. لێیان پرسی لەبەرچی وای لێهاتوە. سییەرڤا ماریا گوتی:" دایکم بە چەقۆ وای لێ کردوە." یەکێك ناویی لێ پرسی‌و ئەویش ناوە رەشپێستانەکەی گوت:" ماریا ماندینگا."

سییەرڤا ماریا بۆ ساتێك جیهانی خۆی بۆ گەڕایەوە. ئەو یارمەتیی بەوە کرد نێرییەك کە لە بەرامبەر مەرگدا بەرگریی دەکرد بکوژنەوە. سییەرڤا ماریا چاوەکانی نێرییەکەی دەرهێناو گونی بڕی‌و ئەو دوو بەشە ئەوانە بوون کە لە خواردنیاندا زیاترین تامی لێ دەدیتن. لە مەتبەخ

لەگەڵ ئەوانی گەورەتردا یاریی بۆلۆی دەکردو لە حەوشیش لەگەڵ منداڵان یاریی کردو لە هەمووانی بردەوە. بە زمانی یورووبایی، کۆنگۆیی،و ماندینگایی گۆرانیی گوتو تەنانەت کەسێك لێشی حاڵی نەبووبا بە تامەزرۆییەوە گوێی دەدایە. بۆ ژەمی نێوەڕۆیە لە هەڵمی چەوریی بەرازدا، خورادنی دونبەڵانو چاوی نێریی لەگەڵ بەهاراتی تیژ ئامادە کرد.

تا ئەم سەعاتە تەواوی پەرستگە بە هاتنی ئەویان زانی جگە لە ژۆزێفا میراندای بەڕێوەبەر. ئەو بوونەوەرێکی تووڕەو شەڕانی، خاوەنی بیرێکی تەسك بوو کە بۆ هۆی بنەماڵەیی دەگەڕایەوە. لە بورگوس لە ژێر سێبەری ئیدارەی کلێسای پیرۆزدا گەورە ببوو، بەڵام ئیستیعدادی فەرماندانو رادەی دەمارگرژیی توندو بێجێی هەر بۆ خۆی دەگەڕایەوە. دوو جێگری شیاوی هەبوون، بەڵام چونکە بۆخۆی بەبێ هیچ چەشنە یارمەتییەك بە هەموو شتێك رادەگەیشت، ئەو دووانە زیادی بوون.

رقو کینەی وی لە دەسەڵاتی ئۆسقۆف تەقریبەن لە سەد ساڵ بەر لە دایکبوونیەوە دەستی پێکردبوو. وەك دوژمنایەتییە گەورەکانی مێژوو، یەکەم هۆی دوژمنایەتی، ناکۆکییەکی چووکە لەسەر کێشەی دراوی‌و سنووری قەزاوەتی نێوان کلاریسیەنەکانو ئۆسقۆفی فرانسیسکاییەکاندا بوو. لەبەرامبەر توندو تیژیی ئەواندا، راهیبەکان لەلایەن حکومەتی مەدەنییەکانەوە پشتیوانییان لیدەکرا، و ئەمە سەرەتای شەڕێك بوو کە هەرجارنا جارێك هەموان لە دژی یەکتر دەستیان پێدەکرد.

ئۆسقۆف بە پشتیوانیی ناوچەکانی دیکە هەوڵی دا بە داخستنی رێگاکانی چوونەدەری پەرستگە، راهیبەکان برسی بکاو فەرمانی سەرپێچی لە دەستووراتی خوا دەربکا، واتە: تا ئاگادارکردنەوەیەکی دیکە دەست لە هەرچەشنە کارێکی خوا ناسانە هەڵبگرن. خەڵك دابەش بوون. مەدەنییەکانو کاربەدەستانی کلێسا بە پشتیوانی لەم یان لەو لە دژی یەکتری دەستیان پێکرد. کلاریسیەنەکان پاش شەش مانگ گەمارۆ زیندوو و لەشکان نەهاتوو بوون. تاکوو تونێلێکی نهێنی دۆزرایەوە کە لە رێگای ئەوەوە لایەنگرەکانیان دابینیان دەکردن. ئینجا فرانسیسکاییەکان بە پشتیوانیی شارەداری نوێ، دەرگای ژووره ئاستەمەکانی پەرستنگەی سانتاکلارایان شکاندو راهیبەکانیان وەدەرنان.

بیست ساڵی گرت تاکوو دڵەکان ئارام بوونەوەو پەرستنگەی تاڵان کراو درایەوە بە کلاریسییەنەکان. پاش سەد ساڵان، ئێستاش ژۆزێفا میراندا لەسەر ئاگری کزی رقو کینەکەی دەکوڵی. ئەو ئەم رقەی بە قیف دەرخواردی شاگردەکان دەدا، بەڵام ئەم رقە لە جیاتی ئەوەی بە

دڵیانەوە بنووسێ، بە نێو ریخۆڵەکانیاندا دەهاتە خوارێو ئۆسقۆف دی کازێ ریس ڤیرتـۆدۆس‌و هەموو ئەو کەسانەکەی کە تۆزێك پێوەندییان پێیەوە هەبووا بە هۆی سەرەکیی ئەم رقـەی دەزانـی. دژکردەوەی وی چاوەڕوانکراو بوو، کاتێك ناوی ئۆسقۆفیان هێنا کە مـارکیز لـە کاسـلدیرئۆوە کـچە دوازدە ساڵانەکەی هێناوەتە پەرستگە  کە نەخۆشیی مەرگ هێنەری جنداری لێی داوە، تەنیا یـەك پرسیاری کـرد:" ئەسـلەن مـارکیزێکی وا هـەر هەیـە؟" پرسـیارەکەی ژەهرێکـی دوو لایەنـەبوو، یەکێکیان سەبارەت بە پێگەی باشی ئۆسقۆف بوو، و ئەوی دیکە سەبارەت بەوە بـوو کـە دانـی بـە مەشروعیەتی خانەدانی کەرئوورلی نەدەناو ئەوانی بە خانەدانی نزم دەزانی.

هەتا کـاتی نـانخورادنی نیوەڕۆیـە هێـشتا نـەیتوانیبوو سـییەرڤا ماریـای لـە پەرسـتگە بدۆزێتەوە. ژنە فەڕاشەکە بە یەکێك لە جێگرەکانی گوتبوو کە پیاوێك لە بەرگی تەعزیەدا لـە یەکەم سەعاتەکانی رۆژدا، کچێکی بە پرچی زەردی مەیلەو سوورەوە لـە بـەرگێکی شـاهانەدا تەحویلی ئەو داوە، بەڵام نەیتوانیبوو بیانناسێتەوە، چونکە لەو کاتەدا سوالکەرەکان لەر ئاشی میوونیکی یەکشەممەی بەر لە جێژنی پاك دەگیانی یەك بەربوون. بۆ سەلماندنی قسەکانی خۆی کڵاوی قردێلەداری بە خانمی بەڕیوەبەر نیشان دا. بەڕێوەبەر نیشانی راهیبەیەکی دا کە بـەدوای کچۆڵەدا دەگەڕا. بەڕێوەبەر گومانی لەوەدا نەبوو کە ئەو کڵاوە ئی کێیە. ئـەو کڵاوەکـەی بـە سەری قامکانەوە گرت‌و بە مەودای ئانیشکی لە خۆی دوور راگرت.

ئەو گوتی:" کچێکی جوانی مارکیزی، بە کڵاوی سۆزانیەکانەوە، شەیتان دەزانێ چ دەکا."

نزیکەی سەعات نۆ  لەسەر رێگەی خۆی بەرەو ئاوەدەست بـەوێدا رۆیـشتبوو‌و لـە بـاغی سەبارەت بە کێشەیەك لە بارەی کرێـی بەننایـەکان لەسـەر لوولـەی ئـاوێ لـە گـۆڕێدا بـوو، راوەستابوو، بەڵام کچۆڵەی لەسەر کورسیی بەرد نەدیتبوو. هەروەها راهیبەکانی دیکـەش کـە دەبێ رێگایان کەوتبێتە ئەوێ، نەویان نەدیتبوو. ئـەو دوو راهیبـە شـاگردانەی ئەنگوسـتیلەی کچۆڵەیان لە قامکی دەرێنابوو، سوێندیان خوراد کە پاش رێورەسمـی ئـاواز خوێنـدن بـەوێدا تێپەڕیون بەڵام نەیان دیوە.

بەڕێوەبرەی پەرستگە خەریکی حەسانەوەی پاشـنیوەڕۆیە بـوو، لـە پـڕ دەنگـی ئـاوازێکی تەکوێژی گوێ لێ بوو کە زایەڵەی دەهەموو پەرستگە دەگەڕا. ئەو، بەنێکی کە لە پەنا تەختی خەوێی بوو راکێشاو یەکدابەدوو راهیبەیەکی شاگرد وە ژووری نیوە تاریك کـەوت. بەڕێوەبـەر پرسیاری کرد ئەوە کێیە ئەوا هونەرمەندانە گۆرانی دەڵێ.

راهیبە شاگردەکە وەڵامی دایەوە:" کچۆڵەکە."

بەڕێوەبەر بە خەوالّوویی‌و بە بۆلّەبۆلّگوتی:" دەنگێکی چەندە خۆشە" و خێرا پرسی:" کام کچۆلّە؟"

راهیبەی شاگرد گوتی:" نازانم، کچۆلّەیەکە لە بەری بەیانیەوە لە حەوشەی پشتەوە بۆتە هۆی دلّەڕاوکێی هەمووان."

بەڕێوەبەر هاواری کرد:" ئەی پیرۆزترین ئایینەکان!"

لە جێ‌وبانێ دەرپەڕی‌و بە هەنگاوی خێرا خێرا لە نێو پەرستگەوە هاوتەریبی دەنگەکە رۆیشت تاکوو گەیشتە شوێنی نیشتەجێی نزمەکان. سییەرڤا ماریا لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، ناڵقەی بسکی لەسەر زەوی راخستبوو لە کۆڕی خزمەتکارە جادوو لێ کراوەکاندا گۆرانیی دەگوت. هەرکە چاوی بە بەڕێوەبەری پەرستگە کەوت بێدەنگ بوو. بەڕێوەبەر ملوانکەی مەسیحی لەخاچدراوی کچۆلّەی گرت‌و گوتی:

" سلاّو لە مەریەمی پیرۆز."

هەموویان لێکرا گوتیان:" ئێمە بێ تاوان چووینە پێشوازیی."

بەڕێوەبەر ملوانکەی مەسیحی لەخاچدراوی وەك چەکێك لە دژی سییەرڤا ماریا جوولاّندو هاواری کرد:" دوور کەونەوە."

خزمەتکارەکان کشانەوەو کچۆلّەیان لەجێی خۆی بەجێ هێشت، ئەو وشیار بووو چاوی لەمۆلەق وەستان.

بەڕوەبەر بەسەریدا نەڕاند:" دەسکردی شەیتان، خۆت وا لێ کردوە نەبینرێی تاکوو سەرمان لێ بشوێنی."

ئەوان نەیان توانی کەلیمەیکیش لە زمانی سییەرڤا ماریای دەرکێشن. راهیبەیەکی شاگرد ویستی دەستی بگرێ‌و لەگەلّ خۆی بەرێ بەلاّم بەڕێوەبەر بە توندوتیژیی تەواوە ئەی هێشت‌و قیژاندی:" دەستی لێ مەدە." و رووی دەوانی دیکەش کرد و گوتی:" کەس دەستی لێ نەدا."

سەرەنجام ئەوان دەبووا بە زۆرەملی سییەرڤا ماریای لەگەلّ خۆیان بەرن. ئەو وەك سەگی هەلّدەبەزی‌و چرنووکی بە دەوروبەری خۆیدا دەگرت تاکوو لە دوایین ژووری تاکەکەسیی زیندان سەری وەدەرنا. لە رێگادا سەیریان کرد کچۆلّە لەشی خۆی لە پیسایی خۆی وەرداوەو ئەوانیش لە تەویلەی بە سەتلاّن ئاویان بەسەردا دەکرد.

بەڕێوەبەر بە تووڕەییەوە گوتی:" لەم شارەدا ئەو هەمووە پەرستگەیە هەیە ئەوجار نۆسقۆف ئەم گلاّوەی دەنێرێتە لای مە."

ژووری زیندان گەورە بوو و دیواری ئەستوورو میچێکی بەرینی هەبوو کەمۆلارە شوێنی قوولّیان لەسەر تەختەکانی درووست کردبوون. لەپەنا تاقە دەرگای ئەوێ پەنجەرەیەك هەبوو کە دەگەیشتە سەر عەرزی، بە نەردەی دار تۆڕنە کرابوو کە نەردەی خواری ئاسن لەتەکانی پەنجەرەکەی قاییمتر دەکرد. لە دیواری پشتەوەی روو بە دەریادا پەنجەرەیەکی بەرزی دیکەش هەبوو کە بە قەرەچێوەیەکی لە داری وەك خاچ بەسترابوو. تەختی خەوێ لە سەر پایەی دیواری بوو و دۆشەگێکی لەسەر بوو کە ئەوەندەی کەلّك لیّ وەرگیرابوو سوابوو. کورسیەکی بەرد بۆ دانیشتن، تاقچەیەکی کار کە هاوکات لەجیاتی مێحراب و مێزی شت لەسەر شووردنێ کەلّکیان لێوەردەگرت. لەولای تەنیا وێنەی هەلّاوەسراوی مەسیحی لەخاچدراوی لە دیواری درابوو. ئەوان سییەرڤا ماریایان لە حالّێکدا هەموو لەشی تەڕ ببوو و لە ترسان هەلّدەرلەرزی بەجێ هێشت. ژنێکی ئێشکگری بە ئەزموونیان لەوێ داناو تاکوو لە شەڕی هەزارساڵە لە دژی شەیتاندا سەرکەوێ.

سییەرڤا ماریا لەسەر تەختی خەوێ دانیشت. سەیری نەردەی ئاسنی پشتی دەرگای کردو کارەکەرێکی دیت کە نزیکەی سەعات پێنجی پاشنێوەڕۆیە قاپێك خورادنێ دێنێ. کارەکەر هەولّیدا ملوانکەکەی لە ملی دەربێنێ. سیێرڤا ماریا جمگەی دەستی گرت و ناچاری کرد دەست لە ملوانکەکەی هەلّبگرێ. لە فایلی پەرستگەدا کە هەر ئێوارەی ئەو رۆژەی کرایەوە، کارەکەرەکە باسی کرد کە هێزێکی وەك هێزی جیهانی دیکە ئەوی بە عەرزیدا دا.

کاتێك دەرگا پێوەدرا، کچۆلّە بەبێ جوولّە لە جێگای خۆی دانیشتبوو و دەنگی زنجیرو دووجار سووڕانی کلیل لە قفلّی زامینی دەرگادا بیسرا. سییەرڤا ماریا هەلّی سەنگاند تاکوو بزانێ چ شتێك بۆ خواردنێ هەیە. دوو تیکە گۆشتی دوورکەلّاوی، شیرینیی مانیك و بەستەیەك چوکلێت. شیرینییەکەی چاشت، جووتیی و رژی کردەوە. لە سەر پشتێ درێژ بوو. دەنگی ئاوی کەفاویی دەریای خرۆشاو و بروسکەی بەهاریی گوێ لیدەبوو کە هەر دەهات و نزیك دەبۆوە. بەیانیی رۆژی دواتر کاتێك کارەکەر بەرچایی هێنا، کچۆلّەی لەسەر لۆدە کایەك بە خەوتوویی دیت کە بە چنگ و ددان لەنێو دۆشەگێی دەرهێنابوو.

بە ئارەزووی خۆی قبوولّی کرد بێ ئەوەی وەعدی مانەوەی پێ بدەن لە عیبادەتگای راهیبەکان بیبەنە هۆلّی نانخواردنێ. ئەوێ هۆلّێکی پان و بەرین بوو کە میچێکی تاقی راست و چەپیی بلّیند و پەنجەرەی دە گەورەی هەبوون. رووناکیی دەریا بە تەوژم خۆی دەژووری دەپاستاوت و دەنگی شەپۆلان کە وەتەختە بەردەکان دەکەوتن لە نزیکەوە دەبیسرا. بیست

کەس، زۆربەیان راهیبەی گەنج لە دوو ریزدا لە دەوری مێزە گەورەکان دانیشتبوون. ئەوان بەرگی رەسمیی کەتانیی تەنکیان لەبەر دابوو و پرچیان چاك کردبوو. خۆشحاڵ بوونو زۆربڵەییان دەکرد. سەبارەت بەوەی کە دەبوا خورادنی هاوبەشی سەربازخانەیەکی لەگەڵ شێتێکی بخۆن تووڕە بوونو بێباکانە لەم بارەیەوە قسەیان دەکرد. سسەرڤا ماریا لە پەنا دەرگای سەرەکی بێ ترس لە نێوان دوو ژنی ئێشکگردا دانیشتبوو و هیچ خواردنێکیشی نەدەخوارد. بەرگی راهیبە نوێشاگردەکانیان لەبەرکرد بوو و ئەو سەرپایانەی کە هێشتا تەڕ بوون لە پێ دا بوون. لە کاتی نانخواردندا کەس سەیری نەدەکرد. پاش نانی ژمارەیەکی زۆر لە راهیبە نوێشاگردەکان لە دەوری کۆبوونەوەو هەوڵیان دەدا بە شتە زینەتییەکانی هەڵبلێن. یەکێکیان هەوڵی دا ملوانکەی کچۆڵەی بکاتەوە. سییەرڤا ماریا لەجێی خۆی هەستا بە تەکانێك خۆی لە دەستی ئەو ئێشکگرانە دەربازکرد کە هەوڵیان دەدا دەستو پێی ببەستن. خۆی هەڵدایە سەر مێزێ، لە گۆشەیەکەوە رای کرد بۆ گۆشەیەکی دی، هەر وەك جندووکەیەکی راستی هاواری دەکردو نفووزی شەیتانیی بۆ نێو لەشی خۆی ئاشکرا دەکرد. هەرچی لەسەر رێگای بوو دەی شکاند، لە پەنجەرەوە دەرپەڕیو دەرگای هاتنە ژووری کەپری حەوشەی خرا کرد. مێشەکانی ئاڵۆز کردنو داری دیوارەکانی تەویلەی هەڵکەندنو نەردەی راوگەکانی تێك دان. مێشەکان لە دەرروبەردا بڵاوبوونەوە ئاژەڵەکان بە ترساوی بە بۆڕاندن رەوینەوە هەتا نزیك شوێنی حەوانەوەی عیبادەتگا رایان کرد.

لەوکاتە بەدواوە رووداوێك نەبوو کە بە حیسابی جادووگەریی سییەرڤا ماریا نەنووسرێ. زۆربەی راهیبە نوێشاگردەکان لە فایلەکاندا باسی ئەوەیان کرد کە کچە بە باڵی دە شەفاف هەڵ دەفرێ کە دەبێتە هۆی دەنگو هەرای مۆتەکەکان. دوو رۆژ کاتو ژمارەیەك کۆیلە پێویست بۆ ئەوەی ئاژەڵەکان بگرنەوە، مێشەکان بگێڕنەوە سەر شانە هەنگوێنەکانیانو پەرستگەی رێكوپێك بکەنەوە. دەنگۆیەکیان بڵاو کردەوە کە گۆیا بەرازەکانیش مەسموم بوون. ئاو، بوو بە سەرچاوەی هێندێك پێشگۆیی بیروبۆچوونەکان. یەکێك لە باڵندەکان بە ترسەوە لەسەر بانان فڕیوەو لە ئاسۆی دەریادا لەبەرچاوان ون بووە. ترسی راهیبە کلاریسیەنەکان پڕ بوو لە شتی دژبەیەك. سەرەڕای دڵەڕاوکێی ئەوانو ترس لەمو لەو، ژووری سییەرڤا ماریا بوو بە ناوەندی سەرنجی هەموو چاوەکان.

لە عیبادەتگادا، دەنگی موناجاتێ لە سەعات حەوتی شەوەوە تا دوعای نوێژی سەعات شەشی بەیانی، نارامیی شەوی شێواندبوو. دەبووا گلۆپەکان بکوژێنەو تەنیا لە هێندێك لە

ژوورەکان ئیزنی ئایسانی ڕووناکییەك درابا. هەرچۆنێك بێ ژیان لە پەرستگە قەت ئەوەندە بە زەحمەتو ئەوەندە ئازاد وەك ئەو کاتانە نەبوو. هەرجارنا جارێك لە دالآنەکاندا تارماییەك خۆی دەنواندو بۆڵەبۆڵێکی نزمو بەپەلە لە گوێڕێدا بوو. لەنێو ژوورەکاندا، لەوجێیەی چاوەڕوان نەدەکرا بە پەڕی ئیسپانیایی یان بە تاسی دەسکرد قوماریان دەکرد، بە دزی شەڕابیان دەخواردەوەو یان بە نهێنی جگەرەی هەڵبەستراویان دەکێشا، ئەو کارانەی کە ژۆزێفا میراندا لەعیبادەتگادا قەدەغەی کردبوون. بوونی کچێکی شەیتان لێدراو لە پەرستگە پەرەی بە کاری تەواو ڕووداو خولقێنانە دەدا.

تەنانەت سەختگیرترین ڕاهیبەکانیش، پاش ناقووسی شەوێ، بە نهێنی لە سنووری عیبادەتگە دوور دەکەوتنەوەو لە تاقمی دوو ــ سێ کەسیدا دەچوونە لای سییەرڤا ماریاو چەنگەکانیان پێ نیشان دەدا، بەلآم زوو فێر بوو لەگەڵ هەرکامیان بەگوێرەی وەزعو بارودۆخی شەوێ ڕەفتاریان لەگەڵدا بکا. ئەغلەب چاوەڕوانیی هەواڵیان لێی هەبوو. دەیانەویست سییەرڤا ماریا تکا لە شەیتانێ بکا کاری دەنەکراو بکا. سییەرڤا دەنگی عاسمانانی لەخۆیەوە دەردێنا، دەنگی لەملدراوان، دەنگی خولقاوەکانی دەستی شەیتان. زۆربەیان تا ڕادەیەك باوەڕیان بە تواناکانی هەبوو. ئەمانەش وەك ڕاستییەك دەچووە نێو فایلەکەیەوە. لە شەوێکی شوومدا، تاقمێك لە ڕاهیبە گەڕۆکەکان هێرشیان بردە سەر ژووری کچۆڵەی. توند بەستیانەوەو ملوانکە پیرۆزەکانیان لە ملی کردەوە. ئەمە سەرکەوتنێکی کاتی بوو. لە کاتی ڕاکردنی بەپەلەدا، سەرۆکی تاقمی هێرشبەران لەسەر پلیکانە تاریکەکان هەڵخلیسکاو کاسە سەری شکا. هاودەستەکانی تا ئەوکاتەی ملوانکە دزییەتییەکەیان نەدابۆوە بە خاوەنەکەی، هەستیان بە ئانارمی دەکرد. ئیدی کەس شەوانە لە ژوورەکاندا سەرئێشەی دروست نەدەکرد.

ئەم ڕۆژانە بۆ مارکیز کاسلدوئیرۆ ڕۆژانی تازیە بوون. ئەو کاتێکی زۆری لەسەر ناردنی کچەکەی بۆ پەرستگە دانا. ئەو لە هەوڵی خۆی بەداخ بوو، تا ئەوەی ئەخۆشیی مالیخولیایی سواری سەری بوو، ئیدی قەت چا نەبۆوە. چەندین سەعاتان لەسەر یەك بە دەوروبەری پەرستگەدا دەخولایەوەو لە خۆی دەپرسی، لە پشت کام یەك لەو پەنجەرە زۆرانەدا سییەرڤا ماریا بیر لە وی دەکاتەوە. کاتێك چۆوە مالێ لە حەوشەی بێرناردای دیت کە چاوەڕوانی یەکەم فێنکییەکانی شەو بوو. بەم پێشبینییەوە کە ئێستا لە بارەی سییەرڤا ماریاوە پرسیاری لیدەکا، لەرزی کەوتێ، بەلآم بێرناردا تەنانەت چاوێکیشی لێ نەکرد.

مارکیز سەگەکانی بەرەڵلا کردن. بە هیوای خەوێکی ئەبەدی لە نێو جۆلانەکەیدا راکشا، بەڵام ئارەزووەکەی وەدی نەهات. بای رۆژهەڵاتێ هەڵی کردبۆیە. شەو گەرمو داگیرساو بوو. ئەنواعی جروجانەوەری مزاحیم لە جۆری مێشو مەگەسە خوێنمژەکان، کە لەبەر تاوێ نارەحەت بوون، بەملایە وەربوون. خەڵك لە ژوورەکانی خەویان تەپاڵەی گایان دەسووتاندن تاکوو برەونەوە. هەستەکان لە بێدەنگیدا دامرکانەوە. خەڵك هەر بەو دڵگەرمیەوە چاوەڕوانی یەکەم بارانی وەرزانەی ساڵ بوون تاکوو لە بەرەکەتی ویدا شەش مانگ دواتریشی نزایە بکەن، تا بەڵکوو بۆ هەمیشە ئارەزووەکانیان وەدی بێ.

هێشتا کازیوەی نەدابوو کە مارکیز بەرەو ماڵە ئابرێ نۆنچیکۆ وەڕێ کەوت. هێشتا دانەنیشتبوو کە لە رادەبەدەر هەستی بە ئارامی کرد تاکوو غەمەکەی دابەش بکا. راستەوخۆ سەری قسانی کردەوە:

" ئەمن منداڵەکەم بە سانتاکلارا ئەسپارد."

ئابرێ نۆنچیکۆ تێنەگەیشت، مارکیز لە دڵنیانەبوونی وی کەڵکی وەرگرت بۆ زەبری دیکەو گوتی:" شەیتانێ لە کچەکەم دەردەکەن."

پزیشکەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو بە ئارامی گوتی:" هەموو شتێکم بۆ بگێڕەوە."

مارکیز بۆی باس کرد: باسی چاوپێکەوتنی خۆی لەگەڵ ئۆسقۆف، پێویستیی بە نزاو پاڕانەوە، بڕیاری کوێرانەی خۆیو شەوە بێ خەوەکانی خۆی کرد. ئەوە پەروەردەی مەسیحییەك بە شێوەی کۆن بوو کە شتێك زیانی بۆ وی نەبێ، بۆخۆی راگرێ. لە کۆتاییدا گوتی:" ئەمن پێم وایە ئەوە فەرمانی خوا بوو."

مارکیز گوتی:" مرۆڤ هیچ کات بەتەواوی بێ دین نابێ. گومان درێژە بە ژیانی خۆی دەدا."

ئابرێ نۆنچیکۆ تێی دەگەیشت. ئەو هەمیشە دەیگوت بێ ئیمانی لە جێیەکدا برینێکی ساڕێژنەبۆوە دروست دەکا کە ئیمان خووی پێوە گرتوە. ئەم برینە قەت نایەڵێ لەبیرچوونە روو بدا. هەرچۆنێك بێ بە دووری دەزانی کە کچەکەی بە تاوانی دژایەتیی شەیتان دوور کردۆتەوە.

ئەو گوتی:" ئەم کارە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ جادووگەریی رەشەکاندا نییە، تەنانەت خراپتریشە. رەشەکان بە قوربانیکردنی باڵندە بۆ خواکانیان واز دێنن، بەڵام دادگای پشکنینی بیروباوەڕ خۆشحاڵ دەبێ مرۆڤە بێ تاوانەکان لەسەر جێگای ئەشکەنجە چوار کوت بکەن یان لە شانۆیەکی ئاشکرادا یەکێکی هەر بە زیندوویی بسووتێنن."

به بۆچوونی وی بوونی بەرێز کایەتانۆ دیلاڤرا لە چاوپێکەوتن لەگەڵ ئۆسقۆف نیشانەی ناخۆشی بوو. ئەو راستو رەوان گوتی:" ئەو جەللادە." لە کاتی باسکردنی ئاماری زانایان لە بارەی سووتاندنی بە زیندوویی نەخۆشە دەروونییەکان لە رابردوودا، کە وەك جێی شێتو مورتەدان گیانی خۆیان لەدەست دەدا، هۆشی لەسەرخۆی نەدەماو لە درێژەی قسەکانیدا گوتی" پێم وایە کوشتنی کچۆڵەی مەسیحیانەتر بوو تا ئەوەی زیندە بەچاڵی بکەن."

مارکیز وەڵامی دایەوە:" لەوکاتەوە کچەکەم دیوە بەرەو زیندەبەچاڵان دەچێ، راست دەمەوێ ئەم کارەی بکەم. بەڵام ئەو دەسەڵاتەم نیە بە پێچەوانەی ویستی خوا بجووڵێمەوە."

ئابرێ ئۆنچیکۆ گوتی:" هەوڵی خۆت بدە، رەنگە رۆژێك خوا کارەکەت بە باش بزانێ."

مارکیز ئەو شەوە داوای لە ئۆسقۆف کرد گەورەی بکا. داوایەکەی بە دەستی خۆی بە زمانێکی پڕ لە رێزو دارشتنێکی مندالانە نووسیو بۆخۆی دای بە نێشکگر تاکوو دڵنیا بێ دەگاتە جێ.

رۆژی دوو شەممە بە ئۆسقۆفیان راگەیاند کە سییەرڤا ماریا ئامادەیە شەیتانێ لەخۆی دوور بکاتەوە. ئەو لەسەر بالکۆنی پڕ لە گوڵە پیالەییەکان، تازە نانی ئێوارێی تەواو کردبوو و زۆری گوێ بەو نامەیە نەدا کە پێی گەیشتبوو. خواردنێکی کەمی خواردو لە فکری ئەوەی دابوو بتوانێ تا سێ سەعاتی دی درێژە بە عیبادەتی خوا بدا. باوکە کایەتانۆ دیلاڤرا بەرامبەری دانیشتبوو و بە دەنگێکی زیندوو بە شێوەی شانۆیی نووسراوەکەی بۆ خوێندەوە. هەردووك شتی کە مارکیز بە حەزو قەزاوەتی خۆی هەڵی بژاردبوون لەگەڵ کتێبەکان دەگونجان.

کۆشکە کۆنەکە بۆ ئۆسقۆف لەرادەبەدەر گەورە بوو. ئەو بە ژووری میوانانو ژووری خەوو بالکۆنی ئاوەڵا کە پاشنیوەڕۆیان بە تەنێ نانی لێ بخواو بحەسێتەوە، رازی بوو. تا ئەوەی کە کاتی بارانە وەرزییەکان گەیشتێ. لە بینای بەرامبەردا کتێبخانەی ئیدارەی ناوچەیی ئۆسقۆفی لێ بوو کە کایەتانۆ دیلاڤرا دای مەزراندبوو و پەرەی پێ دابوو و کردبوویە ئیدارە. لەو سەردەمەدا یەکێك لە باشترین کتێبخانەکانی ئەمریکا بوو. باقیی ژوورەکانی دیکە بریتی بوون لە یازدە ژووری داخراو بەس، کە کەلوپەلی کۆنی دووسەد ساڵەی تێدا خرابوونە سەر یەك.

جگە لە راهیبە کە دەبووا جارناجارێك خواردنی بردبایە سەرێ، کایەتانۆ دیلاڤرا تاقە کەس بوو کە نەیدەتوانی لە کاتی نانخواردنیدا بچێتە ژوورەکانی ئۆسقۆف، ئەویش نەك بەو جۆرەی کە دەیانگوت لەبەر ئیمتیازی تایبەتی، بەڵکوو سەبارەت بەو ئەرکەی وەك خوێنەرەوەی بابەتەکان لەسەر شانی بوو، پۆستێکی تایبەتیی بۆخۆی نەبوو. جگە لە سەرپەرستی کتێبان

پۆستێکی دیکەی نەبوو، بەڵام لەبەر نزیکایەتیی لەگەڵ ئۆسقۆف، بە کردەوە وەك جێگر رەفتاری لەگەڵ دەکراو کەس نەیدەتوانی تەنانەت بیر لەوە بکاتەوە کە ئۆسقۆف بە بێ وی دەتوانێ بڕیارێکی گرنگ بدا. دیلاڤرا ژووری تایبەتیی هەبوونو دیوار بەدیواری ئەم بینایەوە بوو و لە ژوورێڕا رێگەی بۆ نێو کۆشك هەبوو. لە ژوورەکانی کارو ژووری خاوەن پلەوپایەکانی ناوچەدا ژمارەیەك راهیبەیان لێ بوون کە بە کاروباری ماڵە ئۆسقۆفێ رادەگەیشتن. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ماڵی واقعیی کایەتانۆ دیلاڤرا کتێبخانە بوو، رۆژانە هەتا چاردە سەعاتان کاری لێ دەکرو خەریکی خوێندنەوە دەبوو. تەختی خەوێکی سەحرایی هەبوو کە دەنووشتایەوەو هەرکات ماندوویەتیی بەسەردا زاڵ دەبوو لەسەر وێ خەوی لیدەکەوت.

هەواڵی نوێ لەم پاشنیوەڕۆ مێژووییەدا ئەوە بوو کە دیلاڤرا زۆربەی شتەکانی بە هەڵە خوێندەوە. ئەوەی ناناساییتر دەهاتە بەرچاو ئەوە بوو کە بەهەڵە لاپەڕێکی بوارد بێ ئەوەی لە بابەتەکە بگاو هەروا درێژەی بە خوێندنەوە دا. ئۆسقۆف لە بن شووشەی عەینەکەکانی وەك کیمیاگەرێك سەیری ئەوی دەکرد، هەتاکوو دیلاڤرا گەیشتە لاپەڕەکەی دی. ئینجا قسەکانی بە گاڵتەوە پێ بڕی.

" بیر لە چ دەکەیەوە؟"

دیلاڤرا لە جێی خۆی هەڵبەزیو گوتی:" دەبێ بەهۆی گەرماوە بێ."

"بۆ؟"

ئۆسقۆف سەرلەنوێ چاوی تێ بڕیو گوتی:" بە دڵنیاییەوە شتێك زیاتر لە گەرما." هەر بەو راوێژە دووپاتی کردەوە:" ئێستا بیر لە چ دەکەیەوە؟"

دیلاڤرا گوتی:" لە کچۆڵەکە."

قسەیەکی نوێی نەکرد، چونکە لە کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ مارکیزیدا، بۆ ئەو دورانە، لە دنیایەدا، کچۆڵەیەکی دیکە نەبوو. ئەوان لە بارەی سییەرڤا ماریای دا زۆریان قسە کردبوو و پێکەوە بیرەوەرییان لە شەیتان لێدراوەکانو بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی دوژمنانی پیرۆزی شەیتانییاندا چووبوونەوە. دیلاڤرا ئاخێکی هەڵکێشا:" ئەمن خەونم بە کچۆڵەیەوە دیت."

ئۆسقۆف پرسی:" چۆن توانیت خەون بە کەسێکەوە ببینی کە قەتت نەدیوە؟"

وەڵامی دایەوە:" ئەو لە خانەدانی کرئوولیو دوازدە ساڵانە بوو کە ئالقەی بسکی وەك داوێنی بەرگی شازادەیەك عەرزی دەماڵی. جگە لەوی دەکرا کێ بێ؟"

ئۆسقۆف نە پیاوێك بوو خەونو خەیاڵی ئاسمانیی هەبێو نە ئەهلی موعجیزەو هێرش. ئیمپراتۆریی ئەو پێوەندیی بەم جیهانەوە هەبوو. بۆیە سەری بە نیشانەی گومان جووڵاندو

خەریکی خواردنی نانەکەی بۆوە. دیلاڤرا خوێندنەوەی نووسینەکانی سەرلەنوێ بە وردی درێـژە پێدا. پاش ئەوەی ئۆسقۆف لە خواردنێ بۆوە، دیلاڤرا یارمەتیی دا تـاکوو لـە سـەر کورسـیی راحەت دابنیشێ. کاتێك ئۆسـقۆف ئـارام دانیـشت، گـوتی:" زۆر چـاکە، ئێـستا بـۆم باسـی خەونەکەت بکە."

زۆر ئاسان بوو. دیلاڤرا لە خەوێدا دیتی کە سییەرڤا ماریا لەبەرامبەر پەنجەرەیەکی روو بە مەزرایەکی داپۆشراو بە بەفر دانیشتوەو لە هێشووە ترێییەکی کە لە باوەشێ دابوو، بۆڵووەکی لیدەکردەوەو دەیخوارد، هەر بۆڵوویەکی لێی دەکردەوە بۆڵوویەکی دیکەی لـە جـێ دەڕوا. لـە خەوێدا روون بوو کە کچۆڵە ساڵانێکی زۆر لە بەرامبەر پەنجەرەدا بەردەوام دانیشتوەو هـەوڵی داوە هێشووەکەی تا تەواو دەبێ بخواو هیچ پەلەیەکی نەبووە، چونکە زانیویەتی دوایـین بۆڵـوو دەبێتە هۆی مردنی.

" شتێکی سەیرو سەرسوڕ هێنەرە، ئەو پەنجەرەیەی ئەو مەزرای پێدا دەدیـت، راسـت وەك پەنجەرەی ساڵامانکا لەو زستانەیدا بوو کە سێ رۆژان لەسەریەك بەفر باریو مـەڕەکان لـە بـن بەفرێ قڕ بوون."

ئۆسقۆف سەری سوڕ مابوو. ئەو کایەتانۆ دیلاڤرای دەناسیو زۆری خۆش دەویـست. بـەڵام نەیدەتوانی مەتەڵۆکەی خەونەکەی بە هێند وەربگرێ. کایەتانۆ بەو لێهاتوویی‌و هەڵس‌وکەوتـە مێهرەبانانەیەوە بەهەق شایانی ئەو پۆستە بوو کە لە پلەبەندیی ئیـدارەی کلێـسادا بـە نـرخ‌و بایەخی خۆی وەری گرتبوو. ئۆسقۆف چاوەکانی لەسەریەك دانا تا لە سێ دەقە پشووی ئێوارەی دا بخەوێ.

لەم دەرفەتەدا بەر لەوەی ئەوان پێکەوە دەست بە نزای شەوانە بکەن، دیلاڤرا لەسەر هەمان مێز، نانەکەی خوارد. هێشتا تەواوی نەکردبوو کە ئۆسقۆف لـە نێـو کورسـیی راحەتـدا لێـی راکشاو بریاری ماوەی ژیانی خۆیدا:

" ئەمەیان تۆ بەئەستۆی بگرە."

ئەم رستەیەی بێ ئەوەی چاوەکانی بکاتەوە، گـوت‌و وەکـوو شـێر پرخـەی هـات. دیلاڤـرا نانەکەی هەتا تەواو بوو خواردو لەسەر کورسییە هەمیشەییەکەی لە ژێر غونچەی لاولاوەی پێ هەڵگەڕاودا دانیشت. لەم کاتەدا ئۆسقۆف چاوەکانی هەڵێنان‌و گوتی:

" وەڵامت نەدامەوە."

دیلاڤرا گوتی:" وام زانی لە خەوێدا قسەت کردوە."

ئۆسقۆف وەڵامی دایەوە :" ئێستا بەخەبەرمو دووپاتی دەکەمەوە، ئەمن لە بارەی سلامەتیی منداڵەکەوە متمانەم پێتە."

دیلاڤرا گوتی:" ئەمە سەیرترین شتە کە تووشی بووم."

" واتە ناتەوێ قبووڵی بکەی؟"

دیلاڤرا گوتی:" باوکە، ئەمن ئەیاری شەیتانێ نیم. نە ئەو کەسایەتییەم هەیە، نە ئەو زانینو ناسینە کە ئەو ئەرکەم بکەوێتە سەر شان. جگە لەوەش خوا ڕێگایەکی دیکەی خستووەتە پێش."

بەم جۆرە بە واسیتەی ئۆسقۆف، دیلاڤراش هاتە نێو لیستی سێ کاندیدای پۆستی چاوەدێریی دامەزراوەی کلیمیان ئیسپانیۆلیی کتێبخانەی ڤاتیکان. ئەمە یەکەم جار بوو پێکەوە لەم بارەیەوە قسەیان دەکرد. هەرچەند هەردووکیان لێی ئاگادار بوون.

ئۆسقۆف گوتی:" هۆیەکی دیکەش زیاتر، ئەگەر مەسەلەی ئەم کچۆڵەیە ئاخیرەکەی خێر بێ، دەتوانێ هاندەرێکی باش بێ کە ئێستا ئێمە ئەوەمان کەمە."

دیلاڤرا دەیزانی لە پێوەندی لەگەڵ ژناندا دەستو پێ سپیلکەیە. لە ڕوانگەی ئەوەوە ژنان لێهاتوویییەکی ئەگوازراوەو توانای دادوەریان هەیە، و زۆر جێگەی ستایشە کە ئەوان خۆیان لەو مەترسیانە دەپارێزن کە باشاریان ناکرێ.

بیری بەرەورووبوون لەگەڵ ژنێك، تەنانەت ئەگەر بوونەوەرێکی بەستەزمانی وەك سییەرڤا ماریاش بێ، دەبووە هۆی ئەوەی ئارەق لەسەر بەری دەستی بیبەستێ.

لە کۆتاییدا گوتی:" نەخێر پایە بەرز، ئەمن بۆ ئەم مەبەستە خۆم بە شیاو نازانم."

ئۆسقۆف لە بەرامبەردا وەڵامی دایەوە:" هەر ئەتۆ بەتەنێ وا نی، بەڵام ئەتۆ شتێکت هەیە کە ئەوانی دی نیانەو ئەویش زارقاییی تۆیە."

ئەمە قسەیەکی گەورە بوو تاکوو ئەوەی پێشوو ڕەت بکاتەوە. هەرچۆنێك بێ ئۆسقۆف ئەوی ناچار نەدەکرد خێرا داوایەکەی لێ قبووڵ بکا، بەڵکوو دەرفەتی پێ دا تاکوو لە ماوەی حەوتووی جێژنی پاکدا کە تازە دەستی پێکردبوو بیری لێ بکاتەوە.

بە دیلاڤرای گوت:" بچوو سەیرێکی کچۆڵەی بکە، بابەتەکەی بە وردی هەڵسەنگێنەو پێم بڵێوە."

بەم جۆرە بوو کە کایەتانۆ ئال سینۆ دیل سپریتۆ سانتۆ دیلاڤرای سیکۆدار لە تەمەنی سیو شەش ساڵیدا هاتە نێو ژیانی سییەرڤا ماریاو مێژووی شارەکەوە. دیلاڤرا لە ماوەی

سالآنی بەناوبانگی دەرسی زانستە ئایینییەکاندا لەلایەن نۆسقۆفەوە لە سالامانکا خوێندکاری وی بوو و هەر لەو ساڵەدا بەرزترین پلەی دوکتۆرای فەخریی بەدەست هێنا. ئەو پێی وابوو کە باوکی لە شوێنکەوتووانی راستەوخۆی گارسیلاسۆ دیلاڤگا بووە کە لە رووی مەزهەبییەوە تا رادەیەك رێزی بۆ داناوەو هەر لەو سەروبەندەدا ئەو شتەی بە دیلاڤرا گوتبوو. دایکی خەڵکی کیرئولی بوو لە شاری سان مارتین دلۆبای ویلایەتی مومپیکس لەدایك ببوو و لەگەڵ دایكو بابی کۆچی کردبوو بۆ ئیسپانیا. دیلاڤرا بە بیریدا نەداهات هیچی لە دایکیەوە بۆ مابێتەوە، هەتا ئەو کاتەی چووە ئیمپراتۆریی گرانادای نوێو لەوێ دەردی بە میرات پێ گەیشتووی دووری لە نیشتمانی بیر هاتەوە.

هەر لەیەکەم گفتوگۆدا لە سالامانکای، نۆسقۆف دیکازەرەس ڤیرتۆدۆس، شتێکی بەنرخو دەگمەنی لەبەردەمی حۆیدا دیت کە لەسەردەمی خۆیدا بۆ مەسیحییەت مایەی شانازی بوو. لەو رۆژە ساردەی مانگی شوباتێدا کە مەزرای داپۆشراو بە بەفر لە پەنجەرەوە دیار بوو و لە دوورە دیمەنی قەراغ رووبارێدا ریزە سپیدارێك دەهاتە بەرچاو، دیمەنی زستانێ چوارچێوەیەکی بۆ خەونەکانی لاوی پسپۆری زانستە ئایینییەکان پێك هێنابوو کە دەبووا هەتا مردنێ بەدوایدا بگەرێ.

ئەو دووانە بە شێوەیەکی سروشتی لە بارەی کتێبەکاندا قسەیان دەکردو، نۆسقۆف پێی خۆش نەبوو قبووڵ بکا کە دیلاڤرا لەم تەمەنەدا ئەو هەمووە کتێبەی خوێندۆتەوە. دیلاڤرای خوێندکار لەگەڵ نۆسقۆف لە بارەی گارسیلاسۆدا قسەی کرد. مامۆستا قبوولی کرد کە ئەم نووسەرەی باش ناناسێ، بەڵام شتێکی لە بارەی ئەوەوە لەبیرە کە ئەو شاعیرە کافرە لە تەواوی دیوانەکەیدا دوو جاران ناوی خوای نەبردوە.

دیلاڤرا گوتی:" ئەوەندەش دەگمەن نەبوو کە دەفەرمووی، بەڵام لە سەردەمی رێنسانسدا تەنانەت لەلای مەسیحییە باشەکانیش شتی وا هەبوو."

لەو رۆژەدا کاتێك دیلاڤرا بۆ یەکەم جار پەیمان شکێنیی کرد، مامۆستا داوای لێکرد هەتا ناوچەی نا ئەمنی یووکاتای لەگەڵ بچێ کە لەم دواییانەدا بە نۆسقۆفی ئەوێ دیاری کرابوو.

دیلاڤرا کە لە دەلاقەی کتێبەوە دەیروانیە ژیان، جیهانی پانو بەرینی دایکی وەك خەونێك هاتە بەرچاو کە قەت نەی دەتوانی نی ئەو بێ، بیری گەرمای تاقەت پرووکێن، بۆنی بەردەوامی کەلاکی بۆگەن و هەڵمی زۆنگاوەکانی بۆ دژوار بوو. راست لەم کاتەدا مەرە سەهۆڵ بەستووەکانیان لە نێو بەفرێ دەردەکێشان. دیتنی تەواوی ئەو شتانە بۆ نۆسقۆف کە لە شەڕەکانی ئەفریقادا بەشدار بوو، ئاسانتر بوو.

دیلاڤرا گوتی:" بیستوومه که قەشەکانی ئێمە لـە ئەمریکایـە لـە خۆشـبەختیدا نـوقمی خۆشین."

نۆسقۆف وەڵامی دایەوە:" هێندێکیشیان خۆیان دەخێنکێنن . ئەوێ وڵاتێکە مەترسیی بی ناموسی، مورتەدو ئینسانخۆرانی لەسەرە."و بۆ ئەوەی بیر بکاتەوە، درێژەی دا:" وەك وڵاتی رەشپێستەکان."

بەڵام ئەویش لەسەر ئەو باوەڕەی بوو که ئەوێ خۆشییەکی تایبەتیی هەیە، و شـەڕکەری بـە کـاری لێ بوونو بە باشی بایەخەکانی شارستانەتیی مەسیحییان بەرەوپێش دەبردو لە بیابانێش دەیـان تـوانی هەڵ بکەن. بەڵام دیلاڤرای بیستو سێ ساڵە ﴿ پێشتر باسی ۳۳ ساڵەی کراوە ـــ وەرگێـڕی کـوردی ﴾ لەسەر ئەو باوەڕە بوو : ئەو تا ئێستا بێ ئەم لاو ئەو لاو بێ کەموکووڕی ڕێزی لە رووحی پیرۆز گرتـوە، کەوابوو لە دەستە راستیی ویدا داهاتوویەکی روونی دەبێ.

گوتی:" لە ماوەی ژیانمدا ئارەزووم ئەوە بووە سەرپەرستی کتێبان بم. هەر بە کـەلکی ئـەم کارەش دێم."

دیلاڤرا لە پێشبڕکێیەکدا بۆ بەدەستهێنانی پۆستێك لە توولەدوو بەشدار بوو کە تامەزرۆیی ئەوی بۆ بەدەسهێنانی دەردەخستو دڵنیا بوو کە بە ویستی خۆی دەگا. بەڵام مامۆستا هەردوو پێی لە کەوشێکی نابوو و دەستی هەڵنەگرت.

ئەو گوتی:" خاوەن کتێبخانەیەك ببێ بە رووحانی لە یووکاتان، زۆر ئاسانترە لـە شـەهید بوون لە توولە دووی."

دیلاڤرا بەبێ خاکەرایییەوە دووپاتی کردەوە:

" ئەگەر خوا بەزەیی فەرمووبا، ئەمن دەمەویست ببمە فریشتە، نەك رووحانی."

ئەو هێشتا پێشنیاری مامۆستاکەی بە تەواوی هەڵنەسەنگاندبوو کە نامەی نـاردنی خـۆی بۆ توولەدووی وەرگرت، ئاخیری یووکاتانی پێ باشتر بوو. بەڵام قەت پێیان نەکەوتە ئەوێ. پاش حەفتا رۆژان ناارامیی دەریا، پـاش رەنـجو کوێرەوەرییـەکی زۆر، بـە کەشـتییەکی شـکاوەوە گەیشتنە کانالی دێلس ڤینتوس، لەلایـەن هاوڕێکانیانـەوە تووشـی رووداوی خـراپ ببـوون، دەرباز ببوون. رزگاریدەرەکان ئەوانیان لە سانتا ماریا لائانتیگوای دارییێن بە دەستی چارەنووس نەسپارد. زیاتر لە ساڵێکی لەوێ بوونو لەخۆڕا چاوەڕێ مانەوە بۆ ئـەوەی کەشـتیی بازرگـانی نامەیان بۆ بێنێ هەتا ئەوەی کە پۆستی کاتی لەناوچـەیەکی بـچووك کـە سـەرۆکەکەی ئـەوێ لەنەکاو قالبەکەی بۆ نۆسقۆف دیکازە رێس بـەتاڵ کـرد. کاتێـك دیلاڤـرا لـە نێـو بەلەمـەوە

لێرەواری چڕو پڕی یورووبای دیت کە ئەوانی بەرەو ئامانجێکی نوێ دەکێشا، هەستی بە دەردی پڕ ژانی دووریی ئەو نیشتیمانە کرد کە دایکی لە زستانە ناخۆشەکانی توولەدوودا ئازار دەدا. ئێوارە گەرمەکان، باڵندە خەوناوییەکان، بۆگەنی تایبەت بە شەڕ، دارە هەمیشە سەوززەکان، لەبەرچاوی وی بیرەوەرییەکی خۆشی رابردوو بوون کە ئەو قەت لەگەڵیان نەژیابوو.

دیلاڤرا گوتی:" تەنیا رووحی پیرۆز نەیدەتوانی هەمووی ئەمانە بەو جوانییە لەپەنا یەك دابنێ و ئەمن بکێشێتە هەرێمی دایکم."

دوازدە ساڵ دواتر نۆسقۆف دەستی لە خەونی یووکاتان هەڵگرت. ئێستا حەفتاو سێ ساڵی تەواو بوو. لەدەستی رەبۆ دەینالاندو دەیزانی تازە قەت لە سالامانکا چاوی بە بەفرێ ناکەوێتەوە. کاتێك سییەرڤا مارییایان هێنایە پەرستگە بڕیاری دابوو هەرکە رێگای شاگردەکەی بۆ رۆمێ خۆش کرد، دەست لەکار بکێشێتەوە.

کایەتانۆ دیلاڤرا رۆژی دواتر چووە پەرستگەی سانتا کلارا. سەرەڕای گەرمیی هەوا بەرگی خوریی لەبەر کرد، زەرفی ئاوی پیرۆزو جانتایەکی بچووکی کە رۆنی پیرۆزی تێدا بوو وەك یەکەم چەك لە دژی شەیتان سەیریان دەکرا لەگەڵ خۆی هەڵگرت. بەڕێوەبەری پەرستگە دیلاڤرای قەت نەدیبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەی دەبووا بێدەنگ بن، هەواڵ لە بارەی زیرەکی و دەسەڵاتی وی لە نێو ژوورەکانی نێو پەرستگەدا دزەی کردبوو. بەڕێوەبەر نزیکەی سەعات شەشی بەیانی لە شوێنەکەی چووە پێشوازیی ئەو. سەبارەت بە سەرزیندوویەتیی دیلاڤرا، رەنگی بزرکاوی وەك شەهیدان، زایەڵەی ئاوازی دەنگی و تاڵە مووی سپیی پڕ لە رازو نهێنییەکەی کەوتە ژێر کاریگەریی وی. بەڕێوەبەر هیچ کام لەو پاکیانەی نەدەتوانی وەبەرچاو نەگرێ، بە تایبەتییش ئەو یەکێك لە خەباتگێڕانی نۆسقۆفیش بوو. لەبەرامبەردا دیلاڤرا تەنیا سەرنجی بۆلای ئاڵۆزبوونی باڵندەکان راکێشرابوو.

بەڕێوەبەری پەرستگە گوتی:" باڵندەکان لە شەش دانە تێ ناپەڕن بەڵام بەقەد سەد دانان دەقیڕێنن. جگە لەوەی بەرازێك زمانی دەرکێشاوەو بزنێك سێیانەی لەبەر چووە." بە پێداگرتنەوە درێژەی دا:" هەمووی ئەمانە لەو کاتەیەوە روو دەدەن کە نۆسقۆفی تۆ بەو بەخشیشە سێحراوییە بەختەوەری کردووین."

هەروەها هەڵدانی خێرای گوڵەکانی باغ بۆ بەڕێوەبەر جێگەی شكوگومان بووو بە پێچەوانەی سروشت دەهاتە بەرچاوی. لە کاتی رابوردن بە باغێدا باسی ئەوەی کرد کە ئێرە گوڵی وای لێن کە لە رەنگو هەڵدانیان سەرت سوڕ دەمێنێ و ناتوانی خۆت لە بەرامبەر بۆنی

هێندێکیاندا رابگری. بەڕێوەبەری پەرستگە، هەموو رۆژێ شتێکی نائاسایی دەدۆزییەوە. دیلاڤرا لە هەر وشەیەکیڕا تێدەگەیشت کە بەڕێوەبەر لەوی بەهێزترەو بە پەلە وەڕێ کەوت تاکوو چەکەکەی تیژ بکا.

دیلاڤرا گوتی:" ئێمە نەمان گوت کە کچۆڵە شەیتان لێدراوە، بەڵکوو بەڵگە هەیە هێندێك دیاردەی شەیتانی دەتوانین قبووڵ بکەین."

بەڕێوەبەر گوتی:" ئەوەی ئێمە دەیبینین بەشی خۆی شتەکانمان بۆ دەردەخا."

دیلاڤرا گوتی: " سەیرکە، جاری وایە هەرچی دەرکی ناکەین بە ناوی شەیتانی لە قەڵەم دەدەین‌و بیر لەوە ناکەینەوە کە رەنگە لەلایەن خواوە بێ."

بەڕێوەبەری پەرستگە گوتی:" تۆماسی پیرۆز گوتوویەتی، نابێ قەت جارێکیش باوەڕ بە شەیتانێ بکەین، تەنانەت ئەگەر راستییش بڵێ. ئەمن لێبڕاوانە پابەندی ئەو قسەیەم."

بێدەنگی بەسەر نهۆمی دووەمدا زاڵ بوو. لەلایەك ژووری بەتاڵ هەڵکەوتبوون کە لە رۆژدا بە قفڵی زامیندار داخرابوون، و لەلایەکی دیکەش پەنجەرەی لیبوون کە بەرەوڕووی دەریای بەشکۆدا دەکرانەوە.

وێنەدەچوو راهیبە نوێشاگردەکان لە کارەکانی خۆیاندا بەلارێدا بچن،و لە راستیدا تەواوی بیرو هۆشیان بە بەڕێوەبەرو میوانەکانیەوە خەریك بوو کە بەرەو بینای زیندانێ دەهاتن.

بەر لەوەی بگەنە ژووری سییەرڤا ماریا لەو سەری دالانێ، بە پێش ژووری مارتینا راهیبەی پێشوودا رۆیشتن کە بە هۆی کوشتنی دوو کەس لە خوشکانی راهیبە کە بە چەقۆی سەربڕینێ کوشتبوونی، سزای حەبسی ئەبەدیی بۆ بڕابۆوە. ئەو هیچ کات دانی بەو تاوانەیدا نەهێنا. مارتینا یازدە ساڵی تەواو بوو لەوێدا دەژیا،و زیاتر بەهۆی هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی بۆ راکردن بەناوبانگ بوو تاکوو تاوان. ئەو پێی خۆش نەبوو کە قبووڵ بکا زیندانی ئەبەد، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ژووری راهیبەکاندا هەیە. ئەو لەم بارەیەوە هۆی وای ریز دەکردن کە پێشنیاری دا قۆناغی سزایەکەی وەك کارەکەرێك لە خزمەت بە زیندە بەچاڵاندا تێپەڕ بکا. بەو رادەیەی کە هەوڵ‌و گوشاری خۆی بەکار دێنا تاوانەکەی لە خۆی دوور بکاتەوە، بەو رادەیەش باوەڕی بەوە هەبوو کە ئەگەر لەپێناوی ئازادبوونیدا پێویست بێ، جارێکی دیکەش دەست بۆ کوشتن دەبا.

دیلاڤرا بێ ئەوەی لە بەرمبەر هەستی پشکنینی منداڵانەی خۆیدا بەرگری بکا، بە نێو نەردە ئاسنەکانی پەنا پەنجەرەیدا لە ژوورێی ڕوانی، مارتینا رووی لێوەرگێڕان. کاتێك زانی کە

چاویان لەسەرە، گەڕایەوە لای دەرگای،و دیلاڤرا یەکسەر گیرۆدەی هێزی تیشکی ئەو بوو. بەڕێوەبەر بە پەشۆکاوی دیلاڤرای لە پەنا پەنجەرە دوور کردەوەو گوتی:

" ئاگات لەخۆ بێ، ئەم بوونەوەرە هەموو شتێکی لەدەست دێ."

دیلاڤرا پرسی:" ئەوەندە مەترسیدارە؟"

بەڕێوەبەر گوتی:" ترسناکتر لەوەیە کە بیری لێ دەکەیەوە. ئەگەر بە ویستی من بووایە، زۆر لەمێژ بوو ئازاد ببوو. ئەو سەرچاوەی هەموو ئالۆزییەکانی ئەم پەرستگەیەیە."

کاتێك ژنە ئێشکگرەکە دەرگای ژووری سییەرڤا ماریای کردەوە، بۆگەن لە هەوای دا بڵاو بۆوە. کچۆڵە لەسەر پشتێ لەسەر کورسیی بەرد بێ ئەوەی دۆشەگێك راخا راکشابوو، دەستو پێی بە قایشێکی چەرمی بەستبوون. وەك مردووان دەچوو، بەڵام چاوەکانی وەك زولاڵیی دەریا بوون. دیلاڤرا سەیرێکی کردو لەرزەی کەوتە ئەندامانی لەشی، ئەو دیەنی ئەفسووناویی کچەی لەگەڵ پرچی بەراورد کردو ئارەقەیەکی ساردی دەرکرد. دیلاڤرا چاوەکانی لەسەر یەك دانان بە سەبری،و بە هەموو هێزی نمانیەوە نزای کردو پاشان هاتەوە سەرخۆ.

ئەو گوتی:" تەنانەت ئەگەر ئەم بوونەوەرە بەستەزمانە شەیتانیش دەستی بەسەردا نەگرتبێ، کەشوهەوای دەوروبەری، ئەم دۆخەی بۆ پێك دێنێ."

بەڕێوەبەری پەرستگە وەڵامی دایەوە:" شانازیمان بە نسیب نابێ، لە راستیدا کارەکەرەکان هەموو هەوڵی خۆیان بەکار هێنا، تاکوو بارودۆخی ژوورەکە باشتر بێ، بەڵام سییەرڤا ماریا بۆخۆی ئێرەی کردۆتە زبڵدان."

دیلاڤرا گوتی:" شەڕی من بە ئامانجی مەحکوومکردنی تۆ نییە، بەڵکوو لە دژی ئەو شەیتانانەیە کە لە لەشی ویدا دەژین."

ئەو لەسەر پەنجان وەژووری کەوت تاکوو زبڵو زاڵ وەبەر پێیانی نەکەوێ، ئاوی پیرۆزی بە ژوورەکەدا کردو هێندێك دروشمی ئایینیی لەژێر لێودا گوتن، بەڕێوەبەر بە دیتنی پەڵەیەکی تەڕ لەسەر دیواری ترساو هاواری کرد:"خوێن!"

دیلاڤرا سەبارەت بە زوو قەزاوەتکردنەکەی سەرکۆنەی کرد:

ئاوی سوور خۆ نابێ حەتمەن خوێن بێ، باشە با خوێنیش بێ، بەڵام خۆ نی شەیتانێ نیە.

" باشتر وابوو بیر لە موعجیزە بکەیەوە، و تەنیا خوا خاوەنی ئەو دەسەڵاتەیە."

بەڵام پەڵەکە نە نی شەیتانێ بوو و نە موعجیزەی خوا، چونکە کاتێك ئاوی سەر دیواری قسڵێ وشك بۆوە، ئیدی رەنگی سووری پێوە نەما، بەڵکوو بوو بە سەوزێکی تۆخ. بەڕێوەبەر سوور هەڵگەڕا.

راهیبەکانیش هەروەك ژنانی سەردەمی خۆیان، لە هەرچەشنە راهێنانێکی لە ئاستی بەرزدا بێبەش بوون، بەلاّم بەڕێوەبەری پەرستگە هەر لە هەرەتی لاوتییەوە لە بنەماڵەی رێبەرانی ئایینیو مورتەدە گەورەکاندا تەمرینی مشتومڕی زانستیی کردبوو.

دیلاڤرا چاوێکی لێکردو خێرا وەلاّمی دایەوە:" هیچ شتێك بەسوودتر لە گومان نییە لە کاتێکی مەعقوولدا. کتێبی ئاگوستینووسی پیرۆز بخوێنەوە."

بەڕێوەبەری پەرستگەگوتی:" بە وردی خوێندوومەتەوە."

دیلاڤرا گوتی:" کەوابوو جارێکی دیکەشی بخوێنەوە."

بەر لەوەی ئاوڕ لەکچۆڵەی بداتەوە، بە ئەدەبەوە داوای لە ژنە ئێشکگرەکە کرد ژووری بەجێ بێلێ. پاشان بە گرنگییەکی کەمترەوە بە بەڕێوەبەری گوت:

" تکایە، ئەو داوایە ئەتۆش دەگرێتەوە."

بەڕێوەبەر گوتی:" لەسەر بەرپرسایەتیی خۆت."

دیلاڤرا وەلاّمی دایەوە:" ئۆسقۆف بەرزترین پایەیە."

بەڕێوەبەر بە جۆرێك دەرهەڵبوونو پێوەدانەوە گوتی:" پێویست نیە ئەو قسانەم پێ بلێی. ئێمە چاك دەزانین کە ئێوە خواتان بە ئیجارە هەڵگرتوە."

دیلاڤرا لێی گەڕا تاکوو بەم قسەیەی دوایی دڵخۆش بێ. لە پەنا تەختەکە دانیشتو بە وردبینیی پزیشکێك خەریکی پشکنینی کچۆڵەی بوو. ئەو هێشتا هەر دەلەرزی بەلاّم ئارەقەی نەدەکرد.

کاتێك لە نزیکەوە سەیری کرد، سییەرڤا ماریا رووشاویو پەڵەیەکی شینی لەسەر بووو پێستی بەهۆی کێشرانو دەستبەندی قایش سوابووو خوێنی تێگەڕابوو. بەلاّم مەترسیدارترین بەش برینی سەر گوێزینگی لاقی بوو کە هەر لەو کاتەیەوە بە خراپی دەرمان کراوە، هەمیشە گەرم داهاتووە چلکی دەکرد.

دیلاڤرا کاتێك خەریکی پشکنینی سییەرڤا ماریا بوو بۆ بەڕێوەبەری باس کرد کە کچۆڵە نەك بۆ عەزابدانێ، بەڵکوو بۆ ئەگەری ئەوەی کە شەیتانێك چووبێتە نێو لەشیەوە تاکوو رووحی بە تالاّن بەرێ، هێنراوەتە ئێرە.

ئەو پێویستیی بە یارمەتیی بەڕێوەبەر هەیە تاکوو راستییەکەی بۆ دەرکەوێ. هەرچۆنێك بێ، ئەگەری ئەوەکە کچۆڵە گوێی لە قسەکانی ئەوان بووە، یان بەوەی زانیوە کە پێداگریی ئەو لەسەر دوایەکەی لە دڵەوە بوو، رێی تێنەدەچوو.

دوای پشکنین، دیلاڤرا داوای کرد جانتا بچووکەکەی دەرمانانی بۆ بێنن. راهیبە بەرپرسەکە بە درەنگەوە هاتە ژووری. ئەو برینەکەی بە رۆنی داماڵی‌و هەتوانی لەسەر بەست‌و بە فوویەکی ئارام لە گەرمای برینەکەی کەم کردەوە، و سەری سورِ مابوو کە کچۆڵە ئەو ژانەی چۆن تەحەممول کردوە. سییەرڤا ماریا وەڵامی هیچ کام لە پرسیارەکانی ئەوی نەدایەوە. رێنوێنییەکانیی بەدڵ نەبوون‌و گلەییشی لە هیچ نەبوو.

ئەمە سەرەتای شەڕێکی نازایانە بوو کە دیلاڤرا تاکوو بەندەری ئارامی کتێبخانە درێژەی دەدا. ئەوێ گەورەترین خانووبەرەی ئۆسقۆفی بوو کە تەنانەت پەنجەرەیەکی بۆ دەرەوە تێدا نەبوو‌و دیوارەکان بە کۆمێدی ماهاگوونی شووشەیی داپۆشرابوون‌و کتێبێکی زۆری بە سیستەمێکی تایبەتییەوە لەنێودا ریز کرابوون. لە نێو مێزێکی گەورەدا کارتی کەشتی ئاژووتن، دەزگای چاوەدێریی کەش‌و هەوا، و ئامرازەکانی دیکەی دەریاگەڕی دانرابوون. جگە لەوەش، ئەتڵەسێکی تۆپی، کە ئەخشەکێشانی ئەو سەردەمەی لە ئەندازەگرتنی چۆنیەتیی پانبوونەوەی جیهان وێڕای زاراوە‌و دەسخەتەکانی خۆی، کە هەڵەیان تێدا بوو. لە بەشی خوارەوەدا مێزێکی کاریی گوندی کە مەرەکەب، کاردێکی ئاسکی نامان، قەڵەمێکی پەڕی قەلێ، سەعاتی خیزی‌و گوڵدانێك بە مێخەکێکی ژاکاوەوەی لەسەر بوو. نیوەی ژوورەکەی تاریك‌و روون بوو و بۆنی کاغەزی عەمبارکراو، ساردی‌و ئارامیی لێرواری هەبوو.

لە هۆڵی تەنگەبەری پشتەوە، قەفەزەیەکی بەچەند ریزی داری سادە‌و دەرگای داخراوەوە لێ بوو. ئێرە زیندانی کتێبە قەدەغەکراوەکان بوو کە لەلایەن دادگای پشکینینی بیر‌و باوەڕەوە سەبارەت بە " بێڕێزی بە شتە پیرۆزەکان‌و نووسراوەی چیرۆك‌و داستانی داهێنراو " خرابوونە ئەم ریزەوە. جگە لە کایەتانۆ دیلاڤرا هیچ کەس بۆی نەبوو بچێتە ئەوێ، ئەویش بە ئیزنی کاربەدەستانی پاپی مەزن بۆ ئەوەی بتوانێ لە بارەی بنەمای نووسراوە قەدەغەکراوەکانەوە لێکۆڵینەوە بکا.

کتێبخانە کە چەندین ساڵان بەندەری ئارمیی ئەو بوو، پاش ناسینی سییەرڤا ماریا لێی بوو بە دۆزەخ. ئەو ئیدی نەی دەتوانی لەگەڵ دۆستە کلێسایی‌و ئەم دنیاییەکانی کۆڕ ببەستێ، لە پێشبڕکێ ئەدەبییەکاندا بەشدار بێ‌و شەوانی مۆسیقا بەڕێوە بەرێ. دەردی وی لەوەدا کورت کرابۆوە کە سەر لە شارەزایی شەیتان دەربکا، و بەر لەوەی بچێتەوە پەرستگە پێنج شەو‌و رۆژان لەم بارەیەوە خوێندییەوە. رۆژی دوو شەممەی کاتێك ئۆسقۆف دیتی بە هەنگاوی پتەوەوە لە شوێنەکەی دەچێتەدەر پرسی:" چ هەستێکت هەیە؟"

دیلاڤرا گوتی:" رووحی پیرۆز تینوتەوژمی پێ بەخشیوم."

عەبایەکی درێژی کەتانیی سادەی لەبەردا بوو کە حاڵەتی دارشکێنی بـەهێزی پـێ دابـوو، رووحی خۆی لەبەرامبەر گوناه دا چەکدار کردبوو. ئەوە پێویـستیی بـەم تاڵییـە هـەبوو. ژنـە ئێشکگر سڵاوی ئـەوی بـە کرنـۆش وەڵام دایـەوەو سـییەرڤا ماریـا بـە حاڵـەتی تووڕەییـەوە پێشوازیی لێکـرد. بڵاوبـوونی پاشمـاوەی خـواردنو پیـسایی لـە سـەرگۆڕی ژووری، هەناسـە هەڵکێشانی بۆ بە زەحمەت کردبوو. لەسەر مێحرابێ، لە پەنا تیشکی نەمریدا، خـواردنی ئـەو رۆژە بە دەست لێنەدراوی مابۆوە. دیلاڤرا قاپەکەی هەڵگرتو کەچـکێك لووبیـای تێکـەڵ بـە کەرەی بۆ زاری کچۆڵەی برد. سییەرڤا ماریا خۆی کێـشایەوە. چـەندین جـار داوای لێکـردو دژکردەوەی کچە وەك جاری هەوڵێ بوو. دیلاڤرا کەچکێك لووبیای لـە زاری خـۆی نـا، تـامی کردو بێ ئەوەی بیجوێ بە حاڵەتێکی بەڕاستی بێزهێنەرانە لە قاپەکەی کردەوە.

دیلاڤرا گوتی:" راست دەکەی. زۆر ناخۆشە."

کچە کەمترین سەرنجی پێنە دەدا. کاتێك خەریکی دەرمـانی گـوێزینگی سـووتاوی بـوو، مووی لیدەبووە نەشتەرو ناوی لە چاوان دەگـەڕا. پێـی وابـوو بەسـەر کـچەیدا زاڵ بـووە، بـە نارەناری شوانێکی میهرەبان نارامی دەکردەوەو سەرەنجام غیرەتی وەبەرخۆی نا قایشی دەستو پێیانی بکاتەوە، تاکوو لەشی ماندووی بحەسێتەوە. کچۆڵە چەند جار قامکەکانی خوارکردنەوە تاکوو هەست بکا پێوەندیان بە خۆیەوە هەیە،و لاقە سڕەکانی دەرباز بووو لە بەندێی راکێشان. ئینجا بۆ یەکەم جـار سـەیرێکی دیلاڤـرای کـرد، هەڵیـسەنگاندو پـاش هەڵسـەنگاندن، بـۆ مەبەستێکو بە هێزی گیانلەبەرێکی دڕندە خۆی هاویشتە دیلاڤرای. ژنە کارەکەرەکەیارمەتیی دا دەستو لاقی بگرنو بیانبەستن. دیلاڤرا بەر لەوەی ژوورێ بەجێ بێڵی، تەسبیحێکی لە داری سەندەڵ لە گیرفانی دەرێناو بە ملوانکەی سانتەریای سییەرڤا ماریای هەڵاوەسی.

کاتێك ئۆسقۆف ئەوی بە دەموچاوی رووشاوو دەستی برینداری لە کاتی رۆیشتندا دیت، نیگەران بوو، تەنانەت چاولێکردنێکی کەمیش لە دیلاڤرای هەر ناخۆش بوو. بەڵام کاردانـەوەی دیلاڤـرا کـە برینی دەستی خۆی وەك سەرکەوتنێك لەشەڕدا نیشان دەداو لە بـارەی مەترسـیی تـووش بـوون بـە هاریدا قسەی خۆش کردبوون، ببووە هۆی نیگەرانیی زیاتری ئۆسقۆف. داوا لـە پزیـشکی ئۆسـقۆف کرا بە وردی درێژە بە چارەسەرەکان بدا، چونکە دیلاڤرا لەو کەسانە بـوو کـە لـە مـانگگیرانی دوو شەممەی داهاتوودا، سەرەتای کارەساتێکی گەورەیان بەدی دەکرد.

مارتینا لابوردە بکوژی راهیبەکان، بەپێچەوانەی چاوەڕوانی، بەبێ کـەمترین بەربـەرەکانی لەلایەن سییەرڤا ماریاوە وەرگیرا.

مارتینا تەواو بە ڕێکەوت لەسەر پەنجەی پێ لە ژووری وی نزیك ببۆوەو سەیری کردبوو کە دەستو پێیان لە تەختی خەوێ بەستوە. کچۆڵە لەسەر هەست بوو، بە وردیو بە وشیارییەوە سەیری مارتینای کردو سەرەنجام پێکەنینێکی پێشکێش کرد. مارتیناش پێکەنیو بێ هیچ مەرجێك تەسلیم بوو. کەشوهەوایەك بوو کە دەتگوت رووحی دومینگا نادڤینتۆ هەوای ژوورەکەی پڕکردوە.

مارتینا بۆ کچۆڵەی باس کرد، کە کێیەو بۆ دەبێ پاشماوەی ژیانی خۆی لێرە بەرێتەسەر، هەرچەند زۆر لەوانەی سوێندیان بۆ بێ تاوانیی ئەو خواردبوو، تەقریبەن بۆچوونیان گۆڕابوو. کاتێك هۆی زیندانیکرانی سیبەرڤا ماریای پرسی، کچۆڵە دەی توانی خێرا بڵێ، لە بارەی دژایەتیی ئەو لەگەڵ شەیتان چ دەزانێ؟:

" شەیتانێك لە دەروونی من دایە."

مارتینا کچۆڵەی لە حاڵی خۆیدا بە جێ هێشت، چونکە پێی وابوو درۆیە دەکا یان درۆیان بۆ ساز کردوە. ئەو نەیدەزانی کچۆڵە لەو دەگمەن سپی پێستانەیە کە لەگەڵی راست بووە. مارتینا داوای لێکرد تاکوو هونەری میلدۆزیی ئەو بە تاقی بکاتەوە. سیبەرڤا ماریا داوای لێکرد دەستەکانی بکاتەوە تاکوو بتوانێ تاقیی بکاتەوە. مارتینا ئەو مەقەستانەی لەگەڵ کەرەستەکانی دیکەی میلدۆزی لە گیرفانی مانتۆیەکی دابوون، پێ نیشان دا.

مارتینا پێی گوت:" ئەگەر دەتەوەێ با گرێیەکان بکەمەوە. بەڵام پێت دەڵێم کارت پێم نەبێ، دەنا دەتوانم بتکوژم."

سیبەرڤا ماریا گومانی لە مکووڕبوونی مارتینا نەکرد. دەستو پێی کچۆڵەی کردەوەو بە ئاسانی و گوێڕایەڵی هێندێك بەشی بە میل چنیو شێوەی یاریی تیئۆرییەی فێر بوو. مارتینا پێش رۆیشتنی بەڵێنی پێ دا، ئیزن وەربگرێ رۆژی دوو شەممە هەردووکیان بتوانن سەیری رۆژگیرانێ بکەن.

بەرەبەیانیی هەینی پاسارییەکان بە پێکهێنانی قەوسێکی گەورە لە پانتایی ئاسماندا ماڵاوایییان کردو وێڕای ئەمەش بە جیقنەی بۆن ناخۆشی رەنگ ئینندیگووس دەسڕێژیان لە شەقامی بانەکان کرد. تاکوو تاوی نیوەڕۆ جیقنە شلو چەسپییەکانی وشك نەکردەوەو با هەوای نەگۆڕی ، تەقریبەن خەو خۆراك حەرام بوو. بەڵام ترس درێژەی هەبوو. کەس شتی وای وەبیر نەدەهات کە پاسارییەکان لە کاتی فڕیندا جیقنە بکەنو بۆگەنیوەکەیان ژیانیان لێ تاڵ بکا.

لە پەرستگە دیارە کەس گومانی نەبوو کە سیبەرڤا ماریا ئەو دەسەڵاتەی هەیە کە بتوانێ ڕێگەی باڵندەکان بگۆڕێ. تەنانەت دیلاڤراش کە پاش نزای رۆژی یەکشەممە قەرتاڵەیەکی نانی شیرین کڕیو بە دەرگای سەرەکیدا دەڕۆیشت، زانی هەوای ناخۆشە. سیبەرڤا ماریای کا، بگەڕیەکی تەواو

خراپی هەبوو، بەڵام هێشتا تەسبیحی داری سەندەڵی بە ملییەوە هەڵداوەسی، جوابی سەلامێی لە بیر نەدەچووو ئیزنی بەکەس نەدەدا چاوی لێ بکا. دیلاڤرا لەپەنا کچۆڵەی دانیشت، تیکە پەنیرێکی نەرمی لە قەرتاڵەکەی دەرێنا بە تامو چێژەوە خەریکی جووتنی بووو بە زاری پڕەوە گوتی:

" چێژێکی ئاسمانیی هەیە."

نیوەی پەنیرەکەی لەبەر دەمی کچەی ڕاگرت. ئەو خۆی کێشایەوە، بەڵام وەك جاری پێشێ بەرەو دیواری ڕانەوەستا، بەڵکوو دە دیلاڤرای گەیاند کە ژنە ئێشکگرەکە بە دزییەوە سەیری وی دەکا. دیلاڤرا بە هەموو هێزییەوە دەستی بۆلای دەرگا ڕاداشت.

فەرمانی کرد:" برۆ ون بە."

هەرکە ژنە ئێشکگرەکە بزر بوو، کچۆڵە ویستی بە خواردنی تیکە پەنیرێك برسییەتییەکەی نەیەڵێ، ئەو بەشەی ڕۆکردەوە کە قەپاڵی لیدا بوو و گوتی:" تامی جیقنەی پاساریی لێ دێ." هەرچۆنێك بێ وەزعی کچۆڵەی گۆڕابوو. کچۆڵە بە چارسەری برینەکانی پشتی کە دەزوورانەوە بۆخۆی چووە پێش،و بۆ یەکەمجار کاتێ زانی دەستی دیلاڤرای برینی تێکەوتوە، سەرنجی دایە. بە پاکییەکی دوور لە فرتوفێڵ لێی پرسی، چ بووە.

دیلاڤرا گوتی:" دێڵە سەگێکی هاری بچووك، بە دەمێکی درێژی بەقەد ئانیشك، دەستی گەزستووم."

سییەرڤا ماریا دەیەویست برینەکەی ببینێ، دلیلاڤرا لەفافەکەی هەڵگرتو کچۆڵە بە قامکی شەهادە شوێنی برینەکەی کە کەمێك سوورو ڕەش هەڵگەڕابوو، بەجۆرێك لەمس کرد کە وەك بڵێی خەڵووزی داگیرساوە،و بۆ یەکەم جار پێکەنی.

گوتی:" ئەمن لە تاعوونێ خراپترم."

دیلاڤرا لەجیاتی ئەوەی وەڵامێکی ئینجیلیی بداتەوە، دەقی قسەیەکی گارسیلاسۆی گێڕایەوە:" زۆر جار ئازایەتیت دەبێو بەو ئازایەتییەوە دەردو مەینەتان دەچێژی."

دیلاڤرا لە دانپێداهێنان بە شتێکی لەنەکاو دێوەزمەیەك کە لە ژیانیدا دەستی پێ کردوە، ڕەنجاو ڕۆیشت. لە کاتی چوونەدەردا، ژنە ئێشکگرەکە لەلایەن بەڕێوەبەرەوە پێی ڕاگەیاند کە هێنانی خۆراك لەدەرەوەڕا قەدەغەیە، چونکە ئەگەری ئەم مەترسییە هەیە وەك سەردەمی گەمارۆ، یەکێك خواردنی ژەهراوی بنێرێ. دیلاڤرا بە درۆ گوتی ئەو قەرتاڵەکەی بە ئیزنی ئۆسقۆف هێناوەو بە ئەنقەست ڕەخنەی لە خواردنی خراپی زیندانییەکان گرت، ئەویش لە پەرستگەیەکدا کە بە خواردنی باش بەناوبانگ بوو.

لە کاتی نانخواردنی ئێواریدا دیلافرا بە شەوقێکی تازەوە نامەکانی بۆ ئۆسقۆف خوێندنـەوە. ئەو وەك هەمیشە لەگەڵ ئۆسقۆف دوعای شەویان خوێندەوەو چاوەکانی داخستن تـاکوو بتوانێ باشـتر بیر لە سییەرڤا ماریا بکاتەوە. زووتر لە کاتی دیاریکراودا چووە کتێبخانە، بـیری لـە سـییەرڤا ماریـا کردەوە،و هەرچی زیاتر فکری لیدەکردەوە، ئەوەندەش هەستی بە پێویستیی زیـاتر دەکـرد تـاکوو بـیر لەوی بکاتەوە. دیلافرا سۆناتای ئەوینی گارسیلای بە دەنگی بـەرز دەخوێنـدەوەو ترسـی لـە گومـانی خراپ هەبوو کە نەوەکوو لە هەر دێڕێکدا رازێکی شاراوە هەبێ کە کـەم تـا زۆر پێوەنـدیی بـە ژیـانی ئەوەوە هەبێ. نەیتوانی بنوێ. لە تاریك‌و روونی بەیانیدا لەسەر مێزی کارەکەی بـەلادا هـات‌و سـەری وەسەر کتێبێکی کرد کە نەیتوانیبوو بیخوێنێتەوە. لە قووڵایی خەونەکانی خۆیدا، لە کاتی عیبـادەتی بەیانیدا رۆژ داهات، لە ژووری تەنیشتی کلێسا، پارچە مۆسیقای بە پیانۆ بیست. دیلافرا لە خەونێیـدا دەیگوت:" خوا ئاگادرات بێ ماریا دیتودووس لۆس ئانجیلێس." بـە ورێنـەی دەنگـی خـۆی وەخەبـەر هات‌و سییەرڤا ماریای بە رووپۆشی پەرستگە و ئاڵقەی بسکە بریقەدارەکەی سەر شـانیەوە دیـت کـە چۆن مێخەکە ژاکاوەکانی توڕ هەڵدان‌و دەستەگوڵێکی تازە پشکووتووی لە گوڵدانێ هاویشت‌و لە سـەر مێزی دانا. دیلافرا بە دەربڕینێکی ئاگرینەوە باسی لە گارسیلاسۆ دەکرد:" سـەبارەت بـە تـۆ لـەدایك بووم، بۆتۆ دەمرم، ئەمن سەبارەت بەتۆ دەمرم." سییەرڤا ماریا بێ ئـەوەی ئـەو ببینـێ، زەردەیـەکی هاتێ. دیلافـرا بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بـێ، خـەون‌و خـەیاڵ نیـە، چـاوەکانی لەسـەریەك دانـان. کاتێـك هەڵیهێنانەوە، خەونەکەی رەویبۆوە، بەڵام لە کتێبخانە لە بۆنی دەستەگوڵ داوەستابوو.

# ٤

ئۆسقۆف، باوکە کایەتانۆ دیلاڤرای بانگهێشتن کرد تاکوو لەبن کەپری پڕ لە گوڵی پیاڵەیی زەردەدا دانیشن و چاوەڕێی کاتی ڕۆژگیران بن. ئەم کەپرە تەنیا شوێنی ماڵێ بوو دەریا و ئاسمانی لێڕا دیار بوو. کەڵکەکەکان بە باڵی پان و کراوەی خۆیان لە عاسمانێ نەدەجووڵان. وەك بڵێی لەکاتێکدا کە هەڵدەفڕن، مردوون. ئۆسقۆف بە ئارامی خۆی باوەشێن دەکرد. ئەو لەنێو جۆلانەی خۆیدا کە بە دوو پەت بە گیرەیەکەوە توند بەسترابوو، پاڵی دابۆوەو خەریکی بەسەربردنی حەسانەوەی پاشنیوەڕۆی خۆی بوو. لە پەنا وی دیلاڤرا لە نێو کورسیی راحەتدا جینگڵی دەدا. بەزەیی خوا بەسەر هەردووکیاندا باریبوو، ئەوان شەربەتی تەمری هیندییان پێدا دەکرد و لەسەربانی سواڵەتییەوە سەیری ئاسمانی ساو و دوورەدەستیان دەکرد. کەمێك پاش سەعات دوو، ئاسمان بەرەو تاریکی چوو. باڵندەکان هاتنەوە نێو هێلانەکانیان و هەموو ئەستێرەکان لە یەك کاتدا بریسکانەوە. سەرما و سۆزێکی نا ئاسایی جیهانی غافڵگیر کرد. ئۆسقۆف دەنگی ئەو کۆترانەی بیست کە بە گمەگم لە تاریکیدا بە دوای دەنگی باڵی ئەوانی دیکەدا گەڕان.

ئۆسقۆف ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:" خوا ئەوەندە گەورەیە کە تەنانەت باڵندەکانیش هەست بە بوونی دەکەن."

ڕاهیبەیەك کە لەو کاتەدا لەسەر کار بوو، چرایەکی نەوتیی بە شووشەی دووکەڵاوییەوە بۆ ئۆسقۆف هێنا تا بتوانێ ڕۆژێ ببینێ. ئۆسقۆف لەسەر جۆلانەکەی ڕاست بۆوەو بۆ دیتنی ڕۆژگیرانێ بە شووشەی چراو نەوتێ خۆی ئامادە کرد.

ئەو گوتی:" دەبێ بە چاوێکی سەیری بکرێ."و لەکاتێکدا دەیەویست دەنگی هەناسەکانی کۆنترۆڵ بکا درێژەی دا:" ئەگینا مرۆڤ تووشی هەڵە دەبێ و هەردوو چاوەکانی لەدەست دەدا."

دیلاڤرا بێ ئەوەی سەیری ڕۆژگیرانێ بکا، هێشتا شووشەی چرای بەدەستەوە بوو. ئۆسقۆف پاش بێدەنگییەکی دوورودرێژ لە تاریکیدا چاوی بۆ گێڕا و تێگەیشت کە چاوەگەشەکانی بەهۆی جادووی ئەوە شەوە درۆیینە جووڵەیان نایە.

ئۆسقۆف پرسی:" بیر لە چ دەکەیەوە؟"

دیلاڤرا وەڵامی نەدایەوە. ئەو سەیری ڕۆژێی دەکرد کە وەك مانگ خەریك بوو ئاوا دەبێ و شووشەی چرای ئەوتێی بە چاوییەوە گرتبوو زەرەر بە چاوی نەگا. بەڵام هەروا خەریك بوو چاوی لە رۆژ دەکرد.

ئۆسقۆف گوتی:" ئەتۆ ئێستاش هەر خەریکی بیر لە کچۆڵەی دەکەیەوە؟"

کاپەتانۆ ترسا، هەرچەند زۆر جاران لە روانگەی ئۆسقۆفەوە زیاد لە رادە ئاسایی دەردەکەوت، بەڵام ئۆسقۆف قامکی لەسەر شوێنێکی حەساس دانابوو.

کاپەتانۆ گوتی:" خەریك بوو بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم جەماعەتە نزمە دەتوانن مەینەتیی ئەم کچۆڵەی بەرنەوە سەر رۆژگیرانێ."

ئۆسقۆف بێ ئەوەی چاو لەسەر ئاسمانێ هەڵگرێ، سەری لەقاند.

" چۆن دەزانی وا نیە؟ دۆزینەوەی رازو نهێنییەکانی خوا کارێکی ئاسان نیە."

دیلاڤرا وەڵامی دایەوە:" ئەستێرەناسانی ئاسووری هەزارن ساڵ لەوە پێش ئەم رووداوەیان پێشبینی کردوە."

ئۆسقۆف وەڵامی دایەوە:" ئەمە وەڵامی یەسووعییەکە."

کاپەتانۆ بەهۆی ئاڵۆز بوونی فکری، زۆر بە ئاسانی بە بێ شووشە چاوی دەرۆژێیەوە بڕی. نزیکەی سەعات دووو دوازدە دەقە رۆژی وەك پەڕێکی تەوا رەش دیتو چرکەیەکی پتر نەکێشاو وەك نێوەڕاستی شەوێی لێ هات. پاشان رۆژ هاتەوە سەر دۆخی ئاسایی‌و کەڵەبابەکان وەك هەموو بەیانیان بانگیان دا. کاتێك دیلاڤرا دەستی لە سەیرکردنێ هەڵگرت، بازنەی ئاگرینی هێشتا لە چاوەکانی خۆیدا هەست پێدەکرد.

بە تام‌و چێژەوە گوتی:" ئەمن هێشتا رۆژگیرانێ دەبینم، سەیری هەرکوێ بکەم دەیبینم."

ئۆسقۆف شانۆیەکەی بە تەواوبوو راگەیاندو گوتی:" ئەم حاڵەتە هەتا چەند سەعاتی دیکە نامێنێ." پاشان لەنێو جۆلانەیدا دانیشت، لاقەکانی راکێشان، باوێشکێکی داو سەبارەت بە رۆژێکی نوێ سوپاسی خواوەندی کرد.

دیلاڤرا سەرەهەودایەکەی ون نەکردبوو.

ئەو گوتی:" باوکی بەرێز، لەگەڵ هەموو رێزم لە ئاخمەوە، پێم وا نیە شەیتان لە نێو لەشی ئەم بوونەوەرەدا هێللانەی کردبێ."

ئینجا ئۆسقۆف بەراستی سەبری نەمابوو.

" بۆ ئەم قسەیەی دەکەی؟"

دیلاڤرا گوتی:" چونکە پێم وایە کچۆڵە بە تەواوی وێران کراوە."

نۆسقۆف گوتی:" ئێمە بەڵگەی پێویستمان هەیە. نەکا فایلەکانت نەخوێندبێتەوە؟"

بۆچی. دیلاڤرا هەموویانی بە تەواوی و بێ کەموکورتی خوێندبۆوە، بەڵام فایلەکان زیاترو وردتر ڕەنگدانەوەی خوو و خدەی بەڕێوەبەر بوو تاکوو چۆنیەتیی وەزعی سییەرڤا ماریا. شەیتان دەرکردن لە هەموو جێیەك، چ لەو شوێنەی کە بەیانیی زوو ئەو ڕۆژەی هێنایان لێی بوو، چ لە هەر جێگایەکی دیکە بێ کە دەستی لێ دابوو، بەڕێوە چووبوو. هەرکەس پێوەندیی لەگەڵ بووایە دەبووا بەڕۆژوو بێ و پاك بووبایەوە. ڕاهیبەیەکی نوێشاگرد کە ڕۆژی یەکەم ئەنگوستیلەکەی دزیبوو کاری قورسی لە باغچەی سەوزەدا بەسەردا سەپا. دەیانگوت سییەرڤا ماریا نێرییەکی بە دەستی خۆی کوشتۆتەوە، لەتوکوتی کردوەو پاشان گونو چاوەکانی دەرهێناونو بە بەهاراتی تیژ لە هەڵمی چەوراییی بەرازێدا لەسەر ئاگر لێی ناوەو خواردوویەتی. ئەو لێهاتووییەی کە لە زماندا هەیبوو کارەکەی لەخۆی تێك دابوو. چونکە زمان ئەو دەرفەتەی بۆ پێك هێنابوو لەگەڵ ئەو ئەفریقاییانەی لە خێڵی جۆراوجۆر بوون پێوەندیی باشتری هەبێ تا لەگەڵ خەڵکی دیکە، ﴿ کەوابوو ﴾ تەنانەت نەیدەتوانی لەگەڵ هەموو ئاژەڵێك، هەر ئاژەڵێك بێ، قسە بکا. بەیانیی ڕۆژی دوای هاتنی، یازدە تووتیی نێو قەفەس، کە بیست ساڵی تەواو بوو ئەو شوێنەیان ڕازاندبۆوە، بەبێ هۆ گیانیان لەدەست دا. کچۆڵە بە گوتنی گۆرانییە شەیتانییەکان کارەکەری گومڕا کردبوو و چونکە دەیزانی بەڕێوەبەری پەرستگە بەدوایدا دەگەڕێ، خۆی وا لێکردبوو بە چاو نەبینرێ.

دیلاڤرا گوتی:" لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، پێم وایە، ئەوەی لەبەرچاوی ئێمە وەك شەیتان دەنوێنێ، تەنیا خوو خدەی ڕەشەکانە کە لەبەر کەمترخەمیی دایكو بابی، کچۆڵە لاسایان دەکاتەوە."

نۆسقۆف بە ئاگای هێنایەوە:" ئاگات لەخۆ بێ! دوژمن باشتر دەتوانێ کەڵك لە شعووری ئێمە وەربگرێ تاکوو لە هەڵەکانمان."

دیلاڤرا گوتی:" ئەگەر ئێمە شەیتانێ لە بوونەوەرێکی ساغ دەربکەین گەورەترین بوارمان بۆ دوژمن پێك هێناوە."

نۆسقۆف تووڕە بوو.

" دەبێ وای بۆ بچم کە گوێڕایەڵی فەرمانەکان نی؟"

دیلاڤرا گوتی:" باوکی بەڕێز، دەبێ بزانی کە منیش نیزنم هەیە جێگەیەك بۆ شك‌وگومانی خۆم بێڵمەوە، بەڵام بەو پەڕی تەوازوعەوە ملکەچم."

بۆ ئەوەی کە قەناعەتی بە ئۆسقۆف هێنابێ دیسان چۆوە پەرستگە. چاوی چەپی خۆی بەستبوو، بە فەرمانی پزیشك دەبووا تاکوو چاکبوونەوەی یەکجاریی برژانەوەی قەرنیەی چاوی کە لە رۆژگیرانێدا زیانی پێ گەیشتبوو، ببەسرێ. ئەو هەستی بەو چاوانە دەکرد کە لە کاتی رۆیشتن بە باغدا،بە داڵانەکاندا تا بینای زیندان لەسەری بوون. بەڵام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکرد. ئێستا هەموو دانیشتوانی پەرستگە دەیان توانی تا رادەیەك چێژ لە رۆژگیرانێ وەربگرن.

کاتێك ژنە ئێشکگرەکە رێگەی دا بچێتە ژووری سییەرڤا ماریا، دیلاڤرا هەستی کرد دڵی لە نێو سینگیدا دەتۆقێ‌و بە زەحمەت نەیدەتوانی لەسەر پێ راوەستێ. تەنیا بۆ ئەوەی لە بەیانیی ئەمڕۆدا چۆنیەتیی وەزعی کچۆڵەی هەڵسەنگێنێ، پرسی داخوا رۆژگیرانی دیوە. کچۆڵە بەڕاستی لەسەر بالکۆنێڕا دیتبووی. سییەرڤا ماریا تێنەدەگەیشت کە بۆچی دیلاڤرا دەبێ چاوی ببەستێ، چونکە بۆخۆی بەبێ هیچ پارێزێك سەیری رۆژێی کردبوو و هیچی لێ نەهاتبوو. سییەرڤا باسی ئەوەی کرد کە راهیبەکان لەسەر چۆکان سەیری رۆژگیرانیان دەکرد و هەموو کارەکانی پەرستگە پەکیان کەوتبوو. هەتاکوو بانگی کەڵەبابەکان بیسترا. بەڵام ئەوە شتێك نەبوو کە لە دنیایەکی دیکەڕا هاتبێتە بەرچاوی.

کچۆڵە گوتی:" ئەوەی کە هەموو شەوێ دەکرێ ببینرێ، ئەمن دیتم."

لە دەروونی کچۆڵەیدا شتێك گۆڕابوو، بەڵام دیلاڤرا نەیتوانی بەوردی بۆی دەرکەوێ. دیارترین نیشانە تەمێك لە غەم بوو کە لە روخساری نیشتبوو. ئەو بەهەڵە نەچووبوو. هەر کە پشکنینە پزشکییەکانی خۆی دەست پێ‌کردکچە بە چاوی نیگەرانەوە، سەیری ئەوی کرد و گوتی:

" ئەمن دەمرم."

دیلاڤرا ترسا.

" کێ وای پێ گوتووی؟"

کچۆڵە گوتی:" مارتینا."

" ئەوت دیت؟"

سییەرڤا ماریا بۆی باس کرد مارتینا دووجار هاتۆتە ژوورەکەی تاکوو فێری میلدۆزیی بکاو پێکەوە سەیری رۆژگیرانێ بکەن. کچۆڵە گوتی مارتینا باش‌و میهرەبانەو بەڕێوەبەری پەرستگە ئیزنی داوە لەسەر بالکۆن فێری میلدۆزی بێ، و لەوێڕا دەکرێ ئاوابوونی رۆژێ لە دەریادا ببینێ.

دیلاڤرا بێ ئەوەی چاو بترووکێنێ گوتی:" ئاوا. پێی نەگوتی کەنگێ دەمری؟"
کچۆڵە سەری جووڵاند، پێشی خۆی گرت‌و لێوەکانی قووچاندن، تاکوو نەگریە.
" پاش رۆژگیرانێ."
دیلاڤرا گوتی:" پاش رۆژگیرانێ دەتوانێ هەتا سەدەیەك درێژە بکێشێ."
دیلاڤرا دەبووا هۆشی خۆی لەسەر چارەسەرەکەی خڕ بکاتەوە تاکوو کچۆڵە نەزانێ کوڵی گریانێی لە گەرووداپە. سییەرڤا ماریا ئیدی هیچی نەگوت. دیلاڤرا سەری لە بێدەنگی وی سوڕمابوو، جارێکی دیکە سەیری کردو زانی چاوی پڕ بووە لە ئاو.
کچۆڵە گوتی:" ئەمن دەترسم."
خۆی هاویشتە سەر تەختێ‌و بەکوڵ گریا. دیلاڤرا لە کچۆڵەی نزیکتر بۆوەو هەوڵی دا بە ئامرازی دانپێداهێنانی باوکی پیرۆز ئارامی بکاتەوە. لێرەدا بوو کە سییەرڤا ماریا زانی دیلاڤرا نەك هەر پزیشکی چارەسەریەتی بەڵکوو جندووکانیش دەگرێ.
کچۆڵە پرسی:" بۆچی چارەسەرم دەکەی؟"
دیلاڤرا لە کاتێکدا دەنگی دەلەرزی:
" چونکە زۆرم حۆش دەوێی."
سییەرڤا ئازایەتیی ئەوەی بە جیددی نەگرت.
دیلاڤرا لە کاتی گەڕانەوەدا چووە ژووری مارتینا. بۆ یەکەم جار لە نزیکەوە ئەوی دیت، مێکوتە پێستی دەم‌وچاوی خواردبوو، تۆقی سەری کەچەڵ بوو، لووتی زۆر گەورە بووو ددانەکانی وەك نی جرجەمشکێ دەچوون، بەڵام بریسکانەوەی ئەو بریسکانەوەیەکی جیسمانی بوو کە کەش‌وهەوایەکی تایبەتیی هەبوو. دیلاڤرا وای پێ باش بوو لە بەر دەرگایە قسەی لەگەڵ بکا.
ئەو گوتی:" ئەم کچە هۆی پێویستی بۆ فەوتان هەن، داوات لێ دەکەم هۆی دیکەی بۆ دامەتاشە."
مارتینا سەری سوڕمابوو. قەت شتێکی وای بە مێشکی دانەهاتبوو کە مردنی یەکێکی پێشگۆیی بکا، چ بگا بە کچۆڵەکی جوان‌و بەستەزمان. ئەو تەنیا لە حاڵی سییەرڤا ماریای پرسیبوو کە هەموو شتێك بە سێ یان چوار وەڵام دەبڕایەوە کە کچۆڵە بە ناچاری درۆی دەکرد. بەو جیددییەتەوە کە مارتینا قسەی دەکرد، بەس بوو بۆ ئەوەی دیلاڤرا تێ بگا کە سییەرڤا ماریا درۆی لەگەڵ ئەویش کردوە. دیلاڤرا سەبارەت بە هەڵس‌وکەوتی بەپەلەی لەگەڵ ئەو داوای لێبووردنی کردو داوی لێکرد کچۆڵەی سەرکۆنە نەکا.

دیلاڤرا گوتی:" ئێستا چاك دەزانم كە دەبێ چ بكەم."

مارتینا ئەوی لە لەفافەیەكی جادووی وەرپێچاو گوتی:" ئەمن دەزانم جەنابت كێی، و دەشزانم كە بەڕاستی چ دەكەی."بەڵام دیلاڤرا لەم ئاكام گیرییە كە سییەرڤا ماریا پێویستیی بە یارمەتی مرۆڤەكان نیە تاكوو لە تەنیایی ژووریدا لە ترسی مەرگ رزگاری بێ، نارەحەت بوو.

لە حەوتوویەكدا دایكە ژۆزێفا میراندا نامەیەكی درێژی بە خەتی خۆی بۆ ئۆسقۆف نووسی كە پڕ بوو لە رەخنەو گلەیی. ئەو داوای كردبوو كە لە پێوەندی لەگەڵ سییە ڤادا بەپرسایەتی لە كلاریسیەنەكان بستێنێتەوە. چونكە میراندا بوونی ئەوی وەك سزایەك بۆ كەفارەتی گوناهە كۆنەكان سەیر دەكرد. ئەو هێندێك لە رووداوە نائاساییەكانی ناو بردبوون كە لە فایلەكاندا تۆمار كراون و هەموویان تەنیا لە یەكگرتنی پڕ لە شوورەیی كچۆڵە لەگەڵ شەیتاندا پێناسە دەكران. لە ئاخیرێشدا گلەیی لە رەفتاری خۆبەزلزانانەی كایەتانۆ دیلاڤرا، بیركردنەوی ئازادانەی ئەو، رقی تایبەتیی لە میراندا و هەروەها پشتگوێ خستنی رێسای سیلسیلە مەراتب و بردنی خواردن بۆ نێو پەرستگە، كردبوو.

هەركە میراندا چۆوە ماڵێ، ئۆسقۆف نامە دووروودرێژەكەی بە دیلاڤرا نیشان داو بە پێوە چاوێكی بە نامەكەدا خشاند، بێ ئەوەی ماسولكەكانی دەموچاوی تێك چرژێن. لە كۆتاییدا بە توندی تووڕە بوو.

ئەو گوتی:" ئەگەر شەیاتین لە لەشی كەسێكدا هێلانەیان كردبێ، ئەو كەسە خودی ژۆزێفا میراندایە. شەیاتینی رق، شەیاتینی دەرهەڵبوون و دەبەنگی. ئەو قێزەونە!"

ئۆسقۆف لەو تووڕەییە زۆرەی دیلاڤرا سەری سوڕما. دیلاڤرا تێ گەیشت و هەوڵیدا مەبەستی خۆی بە دەنگێكی ئەویتر دەربڕێ.

" میراندا هێزێكی وای داوەتە بە دەسەڵاتی شەیتان كە زۆری نەماوە بە شەیتان پەرستی لەقەڵەم بدەین."

ئۆسقۆف گوتی:" پێگەی پیشەیی من ئیزنم پێ نادا لەگەڵت هاوڕا بم، بەڵام زۆرم پێ خۆش بوو وەك تۆ بووایەم."

ئۆسقۆف سەبارەت بە توندڕەوییەكەی سەركۆنەی كردو داوای لێكرد كەسایەتیی دژواری بەڕێوەبەر بە سەبرو سیكەدانە تەحەموول بكا. " لە ئینجیلدا لەم جۆرە ژنانە زۆرن، و زۆریشیان بە هەڵەی خراپترەوە. سەرەڕای ئەمەش حەزرەتی مەسیح پلەی بەرز كردن." ئەو زیاتر لەمە نەیدەتوانی قسە بكا، چونكە یەكەم بروسكەی ساڵێ وەماڵێی كەوت، سووڕا، بەسەر دەریادا

تێپەڕیو بارانێکی چەشنی کارەبا وەك سەردەمی کتێبی عەسری عەتیق ئەوانی لە باقیی دنیا جیا کردەوە. ئۆسقۆف لەسەر جۆلانەکەی راکشاو نوقمی خەفەتێ بوو.

ئەو ناخێکی هەڵکێشا:" ئێمە چەندە دوورین."

" لە چی؟"

" لە خۆمان. ئەمە دادپەروەرانەیە کە پاش تێپەڕینی ساڵێك تێ دەگەی ئینسان بێ کەسە؟"و چونکە وەڵامێکی وەرنەگرتەوە، دەرفەتێکی دەست کەوت کە یادێك لە دووریی نیشتمان بکاتەوە. " هەر تەنیا فکری ئەوەکە ئەمشەو لە ئیسپانیا تێپەڕ بکەم، هەموو گیانم نیگەرانی دای دەگرێ."

دیلاڤرا گوتی:" ئێمە ناتوانین دەست لە سووڕانی زەوی وەربدەین."

" بەڵام دەمان توانی گوێی پێ نەدەین تاکوو لەو خوارەوە مەینەت نەچێژین.گالیلۆ ئیمانی کەمتر لە چاونەترسییەکەی بوو."

دیلاڤرا ئەو کاتەی ناسی کە لەپڕ پیری بەسەر ئۆسقۆف دا زاڵ بوو و هێندێك قەیران لە شەوی غەمناکدا ئازاریان دەدا. تەنیا کارێك دیلاڤرا نەیدەتوانی بیکا ئەوە بوو کە پێش بە فکرە تاڵو ناخۆشەکانی ئۆسقف بگرێ تا خەوی بەسەردا زاڵ دەبێ.

لە کۆتاییەکانی ئەپریلدا بە شێوەی ئاشکرا هاتنی جێگری پاشایان لە کاتێکی زوودا راگەیاند. دۆن ریگۆد بوونین لۆزانۆ لەگەڵ ژمارەیەك لە راوێژکاران، کارمەندان، خزمەتکاران، پزیشکانی تایبەتیو ئۆرکێسترای چوار کەسیی ژێی کە مەلەکە بۆ رەواندنەوەی ماندوویەتی لە ئەمریکا، پێشکێشی کردبوو، لە رێی سەفەر بۆ ناوەندی حکوومەت لە سانتافەدا بوو. هاوسەری جێگری پاشا بۆرە خزمایەتییەکی لەگەڵ بەڕێوەبەری پەرستگە هەبوو داوای کردبوو لە پەرستگە نیشتەجێ بن.

لە نێو قسڵی بێدەنگ، دلۆپەی هەڵم، تەقەتەقی ناخۆشی چەکوچو توكو نزای مرۆڤە جۆراوجۆرەکاندا کە دەگەیشتە دەرگای هاتنە ژووری ژوورە قەدەغەکراوەکانی پەرستگە، سییەرڤا ماریا لەبیر کرابوو. قەرەچێوەیەکی بینایەکە بەهۆی دەنگو هەرایەکی زۆر تێك ڕما، بەننایەکی کوشتو حەوت کرێکاری دیکە برینداربوون. بەڕێوەبەری پەرستگە ئەم چارەڕەشییەی بردەوە سەر جادووگەریی سییەرڤا ماریاو بەمەبەستی فشارهێنان بۆ سەر سییەرڤا ماریا کەڵکی لەم دەرفەتە وەرگرت کە هاتبووە پێش تاکوو لە رۆژانی رۆژووگرتندا کچۆڵەی بنێرنە پەرستگەیەکی دیکە. ئەمجار مەنتیق هەر وابوو کە هاوسێیەتیی هاوسەری جێگری پاشا لەگەڵ شێتێك داوایەکی دروست نیە. ئۆسقۆف گوێی پێنەدا.

دۆن رۆدریگۆ بوئین لۆزانۆ پیاوێکی خەلکی ئیستوریاو ماقوولو دیمەنێکی ڕێکوپێکی هەبوو، لە یاریی پلوتاو ڕاوەکەودا شارەزا بوو،و بیستو دوو ساڵ جیاوازیی تەمەنی لەگەڵ ژنەکەیدا بە جەفەنگ پڕ کردبۆوە. ئەو لە ناخی دڵەوە پێدەکەنی، تەنانەت بەخۆشی پێدەکەنی،و بۆ سەلماندنی ئەمە هیچ دەرفەتێکی لەدەست نەدەدا. لەو کاتەدا کە بۆنی یەکەم شنەبای کارائیبی بۆ هات، شەوباو بۆنی گوڵاوی هیندی بوونە هۆی ئەوەی جل بەرگە بەهارییەکەی دابنێو بە سینگی رووتەوە رەگەڵ کۆڕی ژنانی زۆربلێ کەوت. ئەو بە کراسی قۆڵدار، بەبێ وتاردانو تەحیەی سەربازی لەگەڵ تەقاندنی تۆپ، سواری کەشتی بوو. ئۆسقۆف بۆ پێشوازی لەوی، سەماو ئاوازی ئیسپانیۆلی، جێژنی یەکگرتنو جێژنەکانی کووم بیامباو هەروەها یاری بەگاو شەڕەکەڵەبابی ئازاد کرد کە هەموویان لە بەرچاوی خەلکی قەدەغە بوون.

هاوسەری جێگری پاشا بە رادەی تەمەنی کچێکی لاو توانای کاری هەبوو کەم حەوسەلە بوو، و بە داهێنانە نوێیەکانی خۆی وەك گێژەڵوکەیەك بەسەر پەرستگە دا زاڵ بوو. گۆشەیەك نەما بە تاقیی بکاتەوە، کێشەیەك نەما سەری لێدەرنەیەنێ،و هیچ شتێکی باش نەما دەستێکی پێدا نەیەنێ. لە کاتی گەڕان بە پەرستگەدا دەیەویست بێ گوێدان بە کۆسپو تەگەرەی ڕاهیبە نوێشاگردەکان، هەموو شتێك چارەسەر بکا. وای لێ هات کە بەڕێوەبەری پەرستگە ئاقڵانە تێ گەیشت تاکوو سەبارەت بە کاریگەریی خراپی زیندان، لە چوون بۆ ئەوێی بگێڕێتەوە.

" دیتنەکەی نایەنێ. ئەوێ دوو کەسی لێن کە شەیتان چووەتە نێو لەشی یەکێکیان."

ئەوندە قسەیە بەس بوو تاکوو هەستی پشکنینی هاوسەری جێگری پاشا بورووژێنێ. هیچ کام لەو قسانە کە ژوورەکانو ڕێکوپێك نەکراونو زیندانییەکان نامادە نین سوودیان نەبوو. هەرکە دەرگا کرایەوە، مارتینا لابوردە خۆی دەبەر لاقی هاوسەری جێگری پاشا هاویشتو داوای لێخۆشبوونی کرد.

دوای هەوڵێکی بێئاکامو هەوڵێکی سەرکەوتووانە بۆ ڕاکردن، شتەکە ئەوەندەش ئاسان نەدەهاتە بەرچاو. یەکەم کوشتن شەش ساڵ پێشتر بە هاوکاریی سێ ڕاهیبەی دیکە، لەسەر بالکۆنی زاڵ بەسەر دەریادا رووی دا، کە ئەو سێیانە بەهۆی جۆراوجۆر بە تاوانی جۆراوجۆر مەحکووم کران. یەکێکیان توانی رابکا. ئینجا ئەردەیان لە پەنجەرەکان داو کارقایەیان لەدالانی ژێر بالکۆنەکاندا کرد. ساڵێك دواتر سێ زیندانیەکەی دیکە دەستو پێی ژنانی ئێشکگریان بەست کە ئەوکات هەر لەو بینایەی زیندانێدا دەخەوتنو بە ڕێگەی تایبەتیی هاتوچۆی کارەکەرەکاندا ڕایان کرد. پاش قەرارو مەدارێك کە قەشەی وەرگری دانپێداهێنان

لەگەڵ دایكوبابی مارتینای دانا، بنەماڵەكەی ناردیانەوە پەرستگە. چوار ساڵی تەواو تاقە زیندانیی ئەوێ بوو و تەنانەت مافی چاوپێكەوتن لە ئاودەستێشی نەبوو و نەی دەتوانی لە نزای رۆژی یەكشەممەدا بەشدار بێ. كەوابوو، لێخۆشبوونی ئاستەم بوو، بەڵام هاوسەری جێگری پاشا بەڵێنی دا ئەو شتەی لەگەڵ مێردەكەی باس بكا.

لە ژووری سییەرڤا ماریادا هەوا هێشتا بۆنی گێچ و قسڵ و دڵۆپەی لێ دەهات، بەڵام رێكوپێكیەكی نوێی تێدا رەچاو كرابوو. هەركە ژنە ئێشكگرەكە دەرگای ژوورێی كردەوە، هاوسەری جێگری پاشا هەستی كرد شنەیەكی سارد بەرەودوا پاڵی پێوە دەنێ. سییەرڤا ماریا بە رووپۆشێكی كە رەنگی كاڵ ببۆوەو بە سەرپایەكی پیس دانیشتبوو و لەوپەڕی ئارامیدا خەریكی میلدۆزی بوو. بریسكانەوەی ئەو هاوكات لەگەڵ رووناكی بوو. كاتێك هاوسەری جێگری پاشا سڵاوی كرد، ئەوكات سەری هەڵێنا. ئەو لە چاوەكانی سییەرڤا ماریادا هەستی بە هێزی پەیامێك كرد كە خۆی لەبەر رانەدەگیرا. لە بنەوە گوتی:" یا ئایینی پیرۆز." و پێی لە ژووری نا.

بەڕێوەبەری پەرستگە لەبن گوێی هاوسەری جێگری پاشای چپاند:" ئاگات لەخۆ بێ. ئەو وەكوو پڵنگێكی مێیە."و پیلی گرت و نەی هێشت زیاتر بچێتە پێش، لام تەنیا سەیرێكی سییەرڤا ماریا بەس بوو تاكوو خۆی لە مەرامی بەڕێوەبەر دەرباز بكا.

شارەوان كە پیاوێكی عەزەب و قارەمانی ژنان بوو، جێگری پاشای بۆ نانخواردنێ لەگەڵ پیاوان بانگهێشتن كرد. ئۆركێسترای چواركەسیی ئیسپانیایی ئامێری ژێداریان لێدەدا، كەسێكیش فووی دە ئامێرێكی فوویی سكۆتلەندیی كۆنی مۆسیقا دەكرد، و ئۆركێسترای تەپڵی سان چینتۆش لەوێ بوون. سەما لەگۆڕێدا بووو رەشەكان بە لاسایی‌كردنەوەیەكی تێكەڵ بە جنێو سووكایەتی بە سەما رەسەنەكانی سپی‌پێستانی موجی كانگا، سەمایان دەكرد. پەردەكانی ئەوسەری هۆڵ بۆ دیسێر هەڵدرانەوەو كۆیلەی حەبەشی كە شارەوان بەقەد كێشی خۆی زێڕی پێدابوو، دەركەوت. ئەو بەرگێكی زۆر تەنكی لەبەر كردبوو كە لەشی دیار بووو رووتییەكەی زیاتر دەردەخست. پاش ئەوەی بەپێی عادەت لە نزیكەوە خۆی بە میوانەكان نیشان دەدا، بە بەرگە تەنكەكەی كە لەسەرەوەرا دەخزیە خواری، لەبەرامبەر جێگری پاشادا راوەستا.

بێ‌عەیبی و بێ‌كەموكورپەكەی جێی نیگەرانی بوو، هیچ شوێنەوارێك لە ئاسنی سووركراوەی كۆیلەفرۆشان لەسەر شانانی نەبوو، لەسەر پشتیشی پەڵەیەك لەمۆری یەكەم خاوەنەكەی بەدی نەدەكرا. لە مەودای نزیكدا هەموو لەشی وەعدی رازونهێنیی لێ دەباری. جێگری پاشا رەنگی بە روانەوە نەما، هەناسەیەكی هەڵكێشاو بە جوولەی دەستی ئەم بوونەوەرە بەچۆكدا هێنەرەی لە مێشكی خۆی دوور كردەوە.

فەرمانی دا:" هەرنەبێ لەبەر ئەم بەڕێزانە، لای بەرن. ئەمن پێم خۆش نیە تا کۆتـایی ڕۆژ دیسان بیبینمەوە." ڕەنگە لە تۆڵەی دەبەنگیی شارەواندا، بەڕێوەبـەری پەرسـتگە، لـە کـاتی خواردنی ئێوارێدا کە بۆ هاوسەری جێگری پاشا لە ژووری تایبـەتیی نـانخواردنی نیوەڕۆیەیـدا ڕێکی خستبوو، سییەرڤا ماریای ناساند. مارتینا لابوردە پێی گوتن:

" ئەگەر هەوڵ نەدەن ملوانکەو بازنەکانی لێ بستێنن، ئەوکات بۆتان دەردەکەوێ ڕەفتاری چەندە ئاقڵانەیە."

هەر واش بوو. ئەوان بەرگی دایەگەورەیان لەبەر کرد کە سییەرڤا ماریا لە کـاتی هاتنیـدا لەگەڵ خۆی هێنابوو، پرچیان بۆ شوشت، بۆیان شانەکردو پەرێشانو بڵاویان کردو بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی جوان بەسەر عەرزیدا بخشێ. هاوسەری جێگری پاشا بۆخۆی دەسـتی گـرتو بـەرەو مێزی مێردەکەی ڕێنوێنیی کرد. بەڕێوەبەری پەرستگە بۆخۆی لە ڕەفتاری سییەرڤا ماریا، لـە بریسکانەوە نوورانییەکەی، لە موعجیزەی پرچی بەقوەتی، غافڵگیر ببوو. هاوسـەری جێگـری پاشا بە نەرمی لە بن گوێی مێردەکی سرتەی کرد:" شەیتان لە لەشی ویدا هێلانەی کردوە."

جێگری پاشا نەیدەویست باوەڕ بکا. ئەو لە بورگوس شەیتان لێـدراوێکی دیتبـوو کـە بـە درێژایی شەو پەیتا پەیتا دەخۆی دەکرد، هەتا ژوورەکەی پڕ کرد. بـۆ ئـەوەی سـییەرڤا ماریـا تووشی چارەنووسێکی لەم چەشنە نەبێ، بە پزیـشکەکانی خـۆی سـپارد. ئـەوان پـشتڕاستیان کردەوە کە کچۆڵە چووکەترین نیشانەی هاریی پێوە نیەو لەگەڵ ئابرێ نۆنچیکۆدا لەم بارەیـەوە بۆچوونی هاوبەشیان هەبوو کە ئیدی حیسابێك بۆ گەڕانـەوەی ئـەم نەخۆشـییە نـاکرێ، بـەڵام هەرچۆنێك بێ لە بارەی شەیتانلێدراویی کچۆڵەدا گومانیان هەبێ.

ئۆسقۆف کەلکی لە بەشداریی میوانداریـیەکە وەرگرت تاکوو لە بارەی نامـەی بەڕێوەبـەری پەرستگەو لە بارەی دوایین بارودۆخی سییەرڤا ماریادا بیرێك بکاتەوە. لـەم کاتـەدا کایـەتانۆ دیلاڤرا خۆی بە نانی مانیوكو ئاوی خواردنەوە لە کتێبخانەدا حەبس کردبوو تاکوو لە بەرەوڕوو بوونەو لەگەڵ شەیتان دەرکردندا پەنا بەرێتەبەر پاكوخـاوێنیی پێویـست. ئـەوە سـەرنەکەوت. کایەتانۆ شەوانی لە پەرێشانیو ڕۆژانی لـە بێخەویـدا بەسـەر دەبـردن. شـێعری ورووژێنـەری دەگوتنو ئەمە تاقە ڕێگە بوو ئەوەی دڵەڕاوکێیەکانی خۆی دامرکێنێ.

سەد ساڵ دواتر کاتێك کتێبخانەیان خاوێن دەکردەوە، بەستیەك کاغەزی شێعرەکانی ئەویان کـە بە زەحمەت دەخوێندرانەوە، دیتەوە. لە یەکـەمینو تـەنیا شـێعری کـە بـە تـەواوی دەخوێندرایـەوە پێوەندیی بە بیرەوەرییەکی خۆیەوە هەبوکە لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا چـلۆن لـەژێر نەرمـە بـارانی

بەهاریدا لە حەوشەی بەردینی مەدرسەی تەڵەبەکان لە ئاڤیلا لەسەر سندووقی مەدرەسەکەی دانیشت. لەو کاتەدا ئەو دوای چەند رۆژ سواری ئێستر تازە لە تولەدووەوە گەیشتبوو، جاکەت و پانتۆڵی باوکیی کە چووکەی کردبۆوە لەبەر دابوو و ئەو سندووقە گەورەیەی کە دوو بەرابەری خۆی قورس بوو هەڵگرتبوو. هەرچی تا کۆتایی دەورەی پڕ لە شانازیی تاقیکاریی پەرستگە پێویستی بوو، دایکی بۆی دانابوو. دەرکەوان یارمەتییدا هەتا نێوەڕاستەکانی حەوشە هەڵی بگرێ، و لەوێ لە ژێر نمەنمەی بارانیدا بەدەستی چارەنووسی ئەسپارد:

" بیبە نهۆمی سێیەم. لەوێ لە هۆڵی خەوتن جێگایەکەت پێ نیشان دەدەن."

لە ماوەیەکی کورتدا هەموو تەڵەبەکان لەسەر باڵکۆنی زاڵ بەسەر حەوشەدا کۆ بوونەوە و هەموویان شاگەشکە ببوون کە ئەو ، تەنیا رۆڵگێڕی ئەم شانۆیە، کە هەر نەیدەزانی شانۆ چیە، لەگەڵ ئەم سندووقە چ دەکا. کاتێك زانی کە نابێ چاوی لە یارمەتیی کەس بێ، ئەو شتانەی نەیدەتوانی لەسەر دەستیان دابنێ، لە سندووقی دەرهێنان و بەسەر بەردی رووتی پلیکانە لێژەکاندا بۆ سەرێی بردن. بەرپرسەکە، لە ریزی دووەمی تەختی خەوی هۆڵی خەوی نوێ شاگردەکاندا جێگای پێ نیشان دا. کایەتانۆ شتومەکەکانی لەسەر تەختێ دانان و چووە حەوشەی، چوار جار سەرو خوارێی کرد تاکوو کارەکەی تەواو بوو. لە کۆتاییدا دەسگیرەی سندووقە بەتاڵەکەی گرت و بەراکێشان بە پلیکاناندا بۆ سەرەوی برد.

مامۆستایان و تەڵەبەکان کە لە پەنجەرەوە سەیریان دەکرد، هەموو جارێ کە بەو نهۆمەدا تێدەپەری، چاویان لێنەدەکرد، بەڵام کاتێك بە سندووقەوە هاتە سەر، باوکە، بەڕێوەبەری مەدرەسەی سەر پلیکانی نهۆمی سێیەم چاوەڕوانی ئەو بوو و سەبارەت بەو سەرکەوتنە چووکەیە لەگەڵ چەپڵە و شادیی تەڵەبەکان بەرەوڕوو بوو. ئێستا کایەتانۆ دەیزانی کە بردنی ئەو سندووقە بۆ سالۆنی خەوی تەڵەبەکان، ئەویش بێ ئەوەی پرسیار بکا و داوای یارمەتی بکا، یەکەم نازایەتیی ئەو بوو کە بوو بەهۆی ئەوەی لە کۆڕی عیبادەتکارانی خواوەندا وەری بگرن. توانای تێگەیشتن، هەڵس‌وکەوتی دۆستانە و توانای کەسیی کایەتانۆ بە شێوەیەکی بەرز لە نێو نوێشاگرداندا ریزی لێ دەگیرا.

بەڵام بیرەوەریی گفت‌وگۆیەك کە لە ئێوارەی ئەو رۆژەدا لەگەڵ بەڕێوەبەری مەدرەسە لە ژووری کاری ئەو هەیبوو، زیاتر لە هەمووان لە مێشکیدا مابۆوە. بەڕوێوەبەری مەدرەسە بانگی کردە ژووری بەڕێوەبەر تاکوو لە بارەی تاقە کتێبێکی زۆر کۆن، ناتەواو و بێ ناوونیشانەوە بدوێن کە لە سندووقەکەیدا دۆزیبۆوە، واتە راست بەو جۆرەی کە بە رێکەوت لە

سندووقی کتێبەکانی باوکی دەری هێنابوو. ئەو لە ماوەی ئەو شەوانەدا کە لە سەفەرێ دا بوو، بەڕێوەبەری مەدرەسە دەیەویست بۆچوونی ئەو لەم بارەیەوە بزانێ.

" ئەگەر هەتا ئاخیرێم خوێندوە، ئەوکات سەری لیدەردەکەم."

بەڕێوەبەری مەدرەسە بە پێکەنینێکی کە نیشانەی ئارامیە، کتێبەکەی وێك نا و لای برد.

" قەت نازانی کۆتاییەکەی چیە. ئەمە کتێبێکی قەدەغەکراوە."

بیستو شەش ساڵ دواتر لە کتێبخانەی تاریكو روونی ئیدارەی ناوچەی ئۆسقۆف، بـۆی روون بـۆوە کە ئەو کتێبانەی بە بن دەستیدا رەت بوون، جا چ قەدەغەکراو بـووبنو چ نـەبووبن، ژمارەیـەکی کـەم نەبێ، هەمووی خوێندوونەوە. دەرکی ئەم مەسەلەیە لەرزەی دەخاتە لەشی، کە هەر لەو رۆژەدا ژیانێـك بە تەواوی کۆتایی هاتو ژیانێکی پێشبینی نەکراوی دیکە دەستی پێکرد.

کایەتانۆ دەستی بە نوێژی پاشنیوەڕۆی هەشتەمین رۆژی بـەرۆژووبوونی خـۆی کردبـوو کـە پێیان راگەیاند ئۆسقۆف بە مەبەستی پێشوازی لە جێگری پاشا، لـە هۆڵەکـە چـاوەڕوانیەتی. چاوپێکەوتن چاوەڕوان نەکراو بوو، بۆ خودی جێگری پاشاش هەر وابوو، ئەو لە یەکەم پیاسـەی خۆی بە نێو شاریدا بە کالیسکە، لە سەعاتێکی گونجاودا ئەو فکرەی بۆ هات. ئێـستا دەبـووا لەسەر بالکۆنی پڕلە خونچەڕا بڕوانێتە سەبانە خـشتییەکان تـاکوو خـاوەن پلەوپایـەکانی کـە لەبەردەستی دابوون کۆ ببنەوە و هۆڵەکە هێندێك رێكوپێك بکرێ.

ئۆسقۆف لەگەڵ شەش رووحانیی بنکـەی خـۆی پێـشوازیی لـە جێگـری پاشـا کـرد. کایـەتانۆ دیلاڤرای لە دەستی راستی جێگری پاشا دانا بێ ئەوەی ناوێك لە پۆستەکەی بێنێ، بە ناوو لەقـەبی تەواوەوە ئەوی ناساند. بەر لەوەی ئۆسقۆف سەری قسان بکاتـەوە، جێگـری پاشـا چـاوێکی پـڕ لـە بەزەیی بە دیوارە وەریوەکان، پەردە کۆنەکان، موبلە هەرزانە دەسکردەکان، رووحانییـەکان کـرد کـە شەلاڵی ئارەقە ببوونو تەشكودامێنی درێژو کۆنیان لەبەردا بوو. ئۆسقۆف کە غـورووری خەوشـدار ببوو، گوتی:" ئێمە ئەوەی یووسفی دارتاشین." جێگری پاشـا ئاماژەیـەکی ئاقلانـەی کـردو باسـی کاریگەریی دیداری هەوتووی یەکەمی کرد. ئەو زۆری لە بارەی ئەخـشەی بەرزەفڕانـە، پەرەپێـدانی بازرگانی لەگەڵ کۆلۆنیەکانی ئینگلیس پاش سارێژبوونەوی برینەکانی شـەڕ، دەسـتێوەردانی زۆر بـە کەلکی دەوڵەت لە کاروباری پەروەردەییدا، پێویستییە هونەریو ئەدەبییەکانەوە گوت بۆ ئەوەی ئەم ناوچە کۆلۆنیانە لەگەڵ جیهان رێك بخرێن.

" ئەمرۆ سەردەمی نوێخوازییە."

نۆسقۆف جارێکی دیکە ناکامگیریی کرد کە دەسەڵاتی جیهانی چەندە بە ئاسانی کار دەکا. ئەو بە قامکی لەرزۆکی شەهادەی، ئاماژەی بە دیلاڤرا کرد، بۆ ئەوەی سەیری بکا، بە جێگری پاشای گوت:

" لێرە باوکە کایەتانۆ بەردەوام بەدوای ڕووداوەتازەکانەوەیە."

جێگری پاشا چاوی بە دوای شوێنی قامکی شەهادەدا گێڕاو لەگەڵ ڕوویەکی تێکچرماو و چاوێکی سەرسوڕماو بەرەوڕوو بوو کە بۆ ئەوەی بیتروکێنێ سەیری دەکرد. بە ئۆگرییەکی زۆرەوە لە دیلاڤرای پرسی:

" کتێبەکانی لاینیتست خوێندوونەوە ؟"

" بەڵێ پایە بەرز." و بۆی باس کرد:" دیارە بە هۆی کارەکەمەوە."

لە کۆتایی دیدارەکەدا دەرکەوت کە ئۆگریی سەرەکیی جێگری پاشا پێوەندیی بە پێگەی سییەرڤا ماریاوە هەیە، سەبارەت بە خودی کچۆڵەکە، سەبارەت بە نیازپاکیی بەڕێوەبەری پەرستگە کە بەهۆی چاوەدێرییەکانی خۆیەوە ئەوی وەجوولە خستوە.

نۆسقۆف گوتی:" ئێمە بەڵگەی کۆتایمان بەدەستەوە نیە، بەڵام فایلەکانی پەرستگە بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە شەیتان دزەی کردۆتە نێو لەشی ئەو بوونەوەرە بەستەزمانەوە. بەڕێوەبەری پەرستگە، لەم بارەیەوە زانیارییەکانی لە ئێمە زیاترن."

جێگری پاشا گوتی:" ئەو دەڵێ پێی تۆ بە تەڵەی شەیتانەوە بووە."

نۆسقۆف گوتی:" نەك هەر ئێمە، بەڵکوو تەواوی ئیسپانیا. ئێمە زەریاکانمان تەنی بۆ ئەوەی قانوونەکانی مەسیح پیادە بکەین، لە نزاکانماندا سەرکەوتین، لە ڕێپێوانە ئایینییەکاندا و لە جێژنە پیرۆزەکانو ئەولیادا سەرکەوتین، بەڵام بۆ لەش نەمان توانی."

ئەو باسی لە یوکاتان کرد، ئەو شوێنەی کە کلێسایەکی گشتیی بە شکۆیان لێ دروست کردبوو هەتاکوو هیرەمە غەیرە مەسیحییەکان بگرێتەوە، بۆ ئەوەی بزانن کە خەڵکی خۆجێیی سەبارەت بەوە دێنە نزایە تاکوو لەژێر مێحرابە زێوینەکانی حەرەمی پیرۆزیاندا درێژە بە ژیانیان بدەن. ئەو باسی تێکەڵاویی خوێنیی کرد کە لە سەردەمی سەرکەتنەوە نیگەرانی بوون: خوێنی ئیسپانیایی یان خوێنی سووریێست، ئەمە یان ئەو، لەگەڵ خوێنی ڕەشە جۆراوجۆرەکانو تەنانەت لەگەڵ خوێنی ماندینگا مسوڵمانەکان تێکەڵ دەبن. لە خۆی پرسی، داخوا دەبێ جێیەك لە لەسەر عەرزی خوای بۆ ئەم تێکەڵبوونە نارەسەنە هەبێ. سەرەڕای نەخۆشیی هەناسەدانو کۆخەی پیرەپیاوانە، بۆ ئەوەی دەرفەتی هەناسەدان بە جێگری پاشا بدا، قسەکانی خۆی هەتا ئاخیرێ کردن:

" باشە، ئەگەر هەموو ئەمانە تەلَّکەی دوژمن نەبن، ئەدی دەکرێ چ بن؟"
جێگری پاشا سەری سوڕ مابوو.
ئەو گوتی:" پایەبەرز وشیارکردنەوەیەکی زۆر توندوتیژ دەدەن."
ئۆسقۆف بە ئەدەبەوە گوتی:" پایەبەرز نابێ وای سەیر بکەن. ئەمن هەوڵ دەدەم روونتر بڵێم، ئێمە پێویستمان بەو هێزە لە ئیمان هەیە کە شایانی ئەو مرۆڤانە بێ بوونە قوربانی."
جێگری پاشا دیسان لە فکرەوە چوو.
" ئەگەر دروست تێگەیشتبم، تێبینییەکانی بەڕێوەبەری پەرستگە کارێکی تەواو ئاساییە. ئەو دەڵێ رەنگە پەرستگەکانی دیکە بتوانن هەلومەرجێکی باشتر بۆ شتێکی ناوا بخەنە ڕوو."
ئۆسقۆف گوتی:" پایەبەرز دەبێ بزانن کە ئێمە سانتاکلارامان خێرا سەبارەت بە راستگۆیی، لێهاتوویی و دەسەلاتی ژۆزێفا میراندا هەڵبژارد، و خوا دەزانێ کە هەق بە ئێمەیە."
جێگری پاشا:" ئەمن ئیزن بەخۆم دەدەم ئەم مەسەلەیەی بە بەڕێوەبەری پەرستگە رابگەیەنم."
ئۆسقۆف گوتی:" ئەو بۆخۆی باش دەزانێ. تەنیا نارەحەتیم لەوەیە کە رەنگە غیرەتی باوەڕکردنی نەبێ."
کاتێک ئەو قسەیەی کرد، نیشانییەک لە هێرشی رەبۆی بە زوویی لە خۆیدا هەست پێکردو بەپەلە کۆتایی بە چاوپێکەتنەکە هێنا. ئەو باسی ئەوەی کرد کە نامەیەکی دوورو درێژی پڕ لە گلەیی لە بەڕێوەبەری پەرستگە بەدەست گەیوەو ئەویش وەعدی داوە، هەرکە چاک بۆوە، بەوپەڕی میهرەبانیەوە کە شایانیەتی جێبەجێی دەکا. جێگری پاشا لەم بارەیەوە سوپاسی کردو چاوپێکەوتنەکەی بە ئاماژەیەک کۆتایی پێ هێنا. ئەویش بەهۆی رەبۆیەکی بەردەوامەوە دەی نالاندو پێشنیاری بە ئۆسقۆف کرد کە خۆی پێشانی پزیشکەکانی بدا. ئۆسقۆف داوایەکەی بەجێ نەهێنا.
ئۆسقۆف گوتی: ئەوەی پێوەندیی بەمنەوە هەیە، هەموو شتێک بە دەستی خوایە. ئەمن ئێستا لەو تەمەنەی دام کە قەیرە کچی ( باکرە ) پیرۆزی تێدا مرد."
بەپێچەوانەی چاکوچۆنیی کاتی هاتنە ژوور، مالاوایی بە هێمنیو بەپێی رەسم کرا. سێ کەس لە رووحانیەکان کە دیلاڤراش لە ریزی وان دا بوو، لە بێدەنگیدا، جێگری پاشایان تا دالانی تاریکی پێش دەرگای سەرەکی بەرێ کرد. پارێزەرانی جێگری پاشا بە باتوونو تەوەرزین کە تێک ترینجابوون، رێگەیان لە سوالکەرەکان گرتبوو. بەر لەوەی جێگری پاشا سواری

کالیسکه بێ، ڕووی دەلای دیلاڤرا کردو قامکی شەهادەی بێ ئەوەی کەمترین نیشانەی هەڕەشەی لەگەڵ بێ بۆلای دیلاڤرا راداشتو گوتی:" کارێکی بکە کە لەبیرت نەکەم."

ئەم رستیە ئەوەندە چاوەڕوان نەکراو ئاڵۆز بوو کە دیلاڤرا تەنیا بە کڕنۆش توانی قەرەبووی بکاتەوە.

جێگری پاشا بەرەو پەرستگە وەڕێ کەوت تاکو بەڕێوەبەر لە ناکامی چاوپێکەوتنەکەی ئاگادار بکاتەوە. راست لە بن پلیکانی کالیسکەی، جێگری پاشان سەرەڕای پێداگریی هاوسەرەکەی لێخۆشبوونی مارتینای رەت کردەوە. چونکە ئەم کارەی بۆ زۆربەی ئەوانەی بە تاوانی جینایەتی مالّی مەحکووم کرابوونو ئەوانی لەهەلومەرجێکی تایبەتیی زینداندا دیتبوون، نموونەیەکی باش نەدەبوو.

ئۆسقۆف کورڕ ببۆوەو لە جێگای خۆی دانیشتبوو و هەولّی دەدا بە چاوی نووقاوەوە پێش بە هانکە هانکی هەناسەکانی بگرێ کە دیلاڤرا هاتەوە. ئەفسەرەکان لەسەر پەنجەی پێ لە شوێنەکە دوور کەوتنەوەو ژوورەکە نیوە تاریك ببوو. ئۆسقۆف چاوێکی بە دەروبەری خۆیدا گێڕا، کورسیە بەتاڵەکانی چاو پێکەوت کە بە ریز لە پەنا دیواری دانرابوون، و تەنیا کایەتانۆ لە هۆڵەکە بوو. بە دەنگێکی نەوی لێی پرسی:

" هەتا ئێستا کەسێکی ئاوا باشمان دیتبوو؟"

دیلاڤرا بە جووڵەیەکی چەند لایەنە وەڵامی ئۆسقۆفی دایەوە.

ئۆسقۆف خۆی بە دەسکی کورسیەوە هەڵاوەسیو بە زەحمەت لە جێی خۆی هەستا، تاکو بەسەر پشوو سواریەکەیدا زاڵ بوو. بە تەما نەبوو ژەمی ئێواریێ بخوا. دیلاڤرا خێرا هەولّیدا چرایەکی هەڵبکاو ڕێگای ژووری نووستن بە ئۆسقۆف نیشان بدا.

ئۆسقۆف گوتی:" هەڵسوکەوتمان لەبەرامبەر جێگری پاشادا باش نەبوو."

دیلاڤرا پرسی:" ئایا هۆیەك هەبوو تاکو هەڵسوکەوتمان باش بووایە؟ بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشوو کەس لە دەرگای ماڵە ئۆسقۆفێ نادا."

ئۆسقۆف ئاوای بیر نەدەکردەوە و ئەمەی بە وشیارییەکی زۆرەوە بە ئاگاداریی دیلاڤرا گەیاند. " دەرگای ماڵە من، دەرگای کلێسایە، ئەو وەکوو مەسیحییەکی کۆن هەڵسوکەوتی کرد. ئەمن بەهۆی سینگ ئێشە رەفتارێکی نەشیاوم کرد،و دەبێ قەرەبووی بکەمەوە." لەبەر دەرگای ژووری خەو هەم دەنگو هەم بابەتەکەی گۆڕی، و لەحالّێکدا کە دوور دەکەوتەوە بە نیعتیمادەوە لە شانی دیلاڤرای داو گوتی:

" ئەمشەو دوعام بۆ بکە، دەترسم دوعایەکە دووروودرێژ بێتەوە."

بەکردەوە ئەو پێی وابوو بە تەوژمی رەبۆ دەمرێ،و لە کاتی چاوپێکەوتنەکە لە پێشەوە ئەو شتەی دەزانی. چونکە دەرمانی رشانەوە لە لیتەی شەراب‌و شەراب‌و شتی دیکەی نارامبەخش نارەحەتیی ئەویان کەم نەدەکردەوە، پێویست بوو دەبووا خوێن لە ئۆسقۆف وەربگرن، لەگەل رۆژ داهات هەستی بە چاکبوونەوە کرد.

کایەتانۆ بە بێ‌خەوی، لە کتێبخانەی تەنیشتێ، ئاگای لە هیچ کام لەمانە نەبوو. ئەو خەریکی نزای بەیانی بوو کە پێیان راگەیاند ئۆسقۆف لە ژووری خەوی خۆی چاوەڕوانیەتی. کاتێك گەیشتە ئەوێ دیتی لە نێو نوێن‌و بانی خۆیدا خەریکی خواردنی نانی بەیانییە بە فینجانێك چوکلێت‌و نان‌و پەنیر. ئۆسقۆف بە جۆرێك هەناسەی هەڵدەکێشا کە دەتگوت بالی لێ‌رواوەو لە رادەبەدەر بە کەیف دەهاتە بەرچاو. تەنیا ئەوەندە بەس بوو بۆ ئەوەی کایەتانۆ سەیری بکا تاکوو بزانێ بڕیاری خۆی داوە.

وا بوو. سەرەڕای پێشنیاری بەڕێوەبەری پەرستگە، سییەرڤا ماریا دەبووا لە سانتا کلارا بمێنێتەوە، و باوکە کایەتانۆ هەروا بە پێی متمانەی تەواوی ئۆسقۆف بەرپرسایەتیی کچۆڵەی لە ئەستۆ بووایە. ئیدی کچۆڵە نەدەبوو لە هەلومەرجی زیندانییەکدا ژیابا، بەڵکوو نەیدەتوانی لە بۆنە گشتییەکانی پەرستگەدا بەشدار بێ. ئۆسقۆف سەبارەت بە چارەسەرکردنی نارِوونییەکانی فایلەکە روونکردنەوەی مەحکەمەکە سوپاسی لێکرد. بەم جۆرە دژە شەیتان نەیدەتوانی بەپێی هەڵسەنگاندنی خۆی بجووڵێتەوە. لە کۆتاییدا بڕیاری دا پێی خۆشە دیلاڤرا بە ناوو دەسەڵاتی تەواوی ئەوەوە، هەرچی بە پێویستی دەزانێ رێکی بخاو لەگەڵ مارکیز دانیشێ‌و ئەگەر هات‌و مارکیز دەرفەتی هەبوو ئەخۆش نەبوو دەتوانێ بێ‌و چاوی پێی بکەوێ. لە کۆتاییدا گوتی:

" فەرمانێکی دیکەم نیە، خوات ئاگادارت بێ."

کایەتانۆ بە دڵێکی هەوساردامالڕاوەوە بە پەلە چووە پەرستگە، بەڵام سییەرڤا ماریای لە ژوورەکەی نەدی. کچۆڵە لە هۆڵی رێورەسمدا دانیشتبوو، زێروزێوی ئەسڵیی بەخۆی هەڵواسیبوو. ئالقەی بسکی هەتا سەر لاقانی بڵاو ببۆوەو بە شکۆیەکی تایبەتیی وەك رەشپێستێك بۆ یەکێك لە هاوڕێیان‌و هاوسەفەرانی جێگری پاشاو وێنەکێشێکی بەناوبانگی روخسار ببوو بە مۆدیلی وێنەکێش. هەروەك جوانییەکی سەرسوڕهێنەری هەبوو، هەر بۆجۆرەش بە زیرەکیەوە گوێی بۆ وێنەکێش شل کردبوو. کایەتانۆ بە تەواوی ئاگای لەخۆی بڕا.

ئەو لەبەر سێبەرێ دانیشتو بێ ئەوەی لەبەر چاوان دیار بێ چاوی بڕیە کچۆڵەکە، بە رادەی پێویست کاتی ئەوەی هەبوو شكوگومانەکانی دڵی بڕەوێنێتەوە.

پاش نۆ سەعاتان تابلۆ تەواو بوو. وێنەکێش لە دوورەوە سەیری کرد، دوو یان سێ هێڵی بە قەڵەمێ بەسەردا هێناو داوای لە سیبەرڤا ماریا کرد تا بەر لەوەی وێنەکەی ئیمزا بکا، سەیری بکا. راست وەك خۆی وا بوو، ئەوی بە پێوە لە سەر هەوران، لە نێو كۆشكی شەیاتینی ژێر پێی نیشان دەدا. کچۆڵە بێ پەلەکردن سەیری وێنەکەی کردو خۆی لە درەوشانەوەی تەمەنی ئێستایدا ناسیەوە، سەرەنجام گوتی:

" ئەم وێنەیە وەکوو ئاوێنەیەك وایە."

وێنەکێش پرسی:" ئەویش سەبارەت بە شەیاتین؟"

کچۆڵە پرسی:" هەر وایە."

پاش دانیشتنەکە کایەتانۆ هەتا ژوورێ لەگەڵ کچۆڵەی رۆیشت. ئەو قەت رۆیشتنی سیبەرڤا ماریای نەدیتبوو. کچۆڵە ئەوەندە بە جوانیو قالبسووکیەوە لەنجەی دەکرد کە دەتگوت سەمایە دەکا. قەتی ئەو لە بەرگێکی جگە لە رووپۆشی ژنانی پەرستگەدا نەدیبوو، و ئەم بەرگە شاهانەیە پێگەیشتوویی و سەنگینیی پێ دابوو و حاڵەتی ژنانەی ئەوی ئاشکرا دەکرد. قەت پێکەوە بە رێگادا نەڕۆیشتبوون. کچۆڵە تامی لەو ئاسوودەییە دەدیت کە پێکەوە بە رێگادا دەڕۆن.

لە کاتی ماڵاواییدا، بە شوکرانە بژێریی لێزانیی جێگری پاشاو هاوسەرەکەی لە رازی کردنی بەرێوەبەری پەرستگە لەگەڵ بۆچوونەباشەکانی ئۆسقۆف، ژوورەکە هێندێك ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات. دۆشەگێکی تازەی خەو، مەلافەیەکی خوریو باڵنجێکی پەڕو وردە شتی دیکەیان بۆ پاكو خاوێنیو حەمام دایە. تیشکی دەریا لە پەنجەرەی بێ نەردەوە لە ژوورێ دەداو لەسەر دیواری تازە قسڵ کراو دەدرەوشایەوە. چونکە سیبەرڤا ماریا هەر لەو خواردنەی دەخوارد کە راهیبەکانی نیشتەجێی ئەوێ دەیان خوارد، ئیدی پێویست نەبوو شتێکی لە دەرەوە ڕا بۆ بێ، بەڵام دیلاڤرا هەمیشە نەیدەتوانی هێندێك نوقڵو شیرینیی بە تامی لە دەرگای سەرەکیەوە بە قاچاغی بۆ بێنێتەوە ژوورەوە.

سیبەرڤا ماریا دیەویست خواردنی شەوێی لەگەڵ بەش بکا. دیلاڤرا بە بیسکویتێك کە ناوی راهیبەکانی لەسەر نووسرابوو قەناعەتی هێنا. لە کاتی نانخواردندا هەروا بەرێکەوت باسی کرد:

" ئەمن لەگەڵ بەفرێ ئاشنا بووم."

کایەتانۆ ئارام بوو. پێشتریش جارێکی گوتبوویان، جێگری پاشا دەیەویست لەزنجیرە کێـوی پیرنە ئێنەوە بەفرێ بێنێ بۆ ئەوەی خەڵکی خۆولاتی لەگەڵی ئاشنا بن، بەڵام ئەو نەیدەزانی کە ئێمە بۆخۆمان لە زنجیرە کێوی سییەرەڕا نیڤادا دیسانتا مارتا لە دەوروبـەری دەریـا بـەفرمان هەیە. رەنگە دۆن رۆدریگۆ دی بۆێن لۆزانۆ بە هونـەرە نوێیـەکانی ئـەم دوو رەگەیـەی بـەرەو کۆتاییەکی بە شکۆ رێنوێنی کردبێ.

کچۆڵە گوتی:" نا، ئەوە خەونێك بوو."

بۆ کایەتانۆی باس کرد: لە پەنا پەنجەرە دانیشتبوو کە لە بەرامبەریدا بەفرێکی زۆر بـاری‌و ئەویش هاوکات بۆڵووبۆڵووی لە هێشووە ترێیەك دەکردەوە کە لە باوەشی دابووو دەی خـوارد. دیلاڤرا شەقەیەکی ترسناکی باڵی هەست پێکرد. لە ترسی ئەو وەڵامەی کە لە پرسیاری خـۆی وەری دەگرتەوە دەلەرزی، غیرەتی وەبەر خۆی ناو پرسی:

" چۆن تەواو دەبێ؟"

سییەرڤا ماریا گوتی:" دەترسم بۆتی باس بکەم."

دیلاڤرا لەوە زیاتر نەیدەویست ببیسێ. چاوەکانی لەسەریەك دانان‌و دوعای کرد. کاتێك لە دوعا بۆوە، ئەو ببووە مرۆڤێکی دیکە.

ئەو گوتی:" غەمێ مەخۆ، بەڵێن دەدەم بە شوکری لێخۆشـبوونی خـوای زۆر زوو ئـازاد‌و بەختەوەر بی."

بێرناردا هەتا ئەم رۆژە نەیدەزانی سییەرڤا ماریا لە پەرستگەیە. ئەو تەفریبەن بە رێکەوت لە شەوێکدا، کاتێك لەگەڵ دولچە ئۆلیڤیا کە خریکی پاك‌وخاوێنیی ماڵێ بوو، بەرەوڕوو بـوو و بەبێ مشووری لەقەڵەم دا، بەو شتەی زانی. بە دوای وەڵامدانەوەیەکی مـەنتیقی‌و عەقلانیـدا یەك یەکی ژوورەکان دەگەڕا و لە کاتی گەڕانەکەیدا وەبیری هاتەوە کـە سـییەرڤا ماریـای لـە مێژە نەدیوە.

کاریداد دیل کوبرێ هەرچی دەیزانی پێی گوت:

" بەڕێز مارکیز پێی گوتین کە سییەرڤا ماریا دەچێتە سەفەرێکی دوورودرێژ‌و ئێمـە قـەت نایبینینەوە." چونکە چرای ژووری مێردەکەی دایسا، بەبێ لە دەرگادان وەژوور کەوت.

مێردەکەی لەسەر جۆلانەی راکشابوو،‌و بۆنی تەپاڵەی مانگای، دەوروبەری داگرتبوو بـۆ ئـەوەی مێشوولەکان دوور بکەونەوە. ئـەو چـاوێکی بەهاوسـەرە سـەیرەکەی داخـشاند کـە رووپۆشـێکی

ئاوریشمیی لەبەردا بوو. پێی وابوو خەونە، چونکە رەنگ زەردو ژاکاو بوو، لەبەر چاوانی وای دەنواندکە لە دوورەوە نزیك دەبێتەوە. بێرناردا لە بارەی سییەرڤا ماریاوە پرسیاری لێکرد.

ماركیز گوتی:" ئەو چەند رۆژێکە لە لای ئێمە نیە."

خراپترین فکری بە زەینیدا هاتن، دەبووا لەسەر یەکەم کورسی دابنیشێ تاکوو هەناسەیەك هەڵکێشێ. بێرناردا پرسی:" مەبەستت ئەوەیە ئابرێ نۆنچیکۆ ئەو کارەی دەبوو بیکا، کردی؟"

ماركیز ئاماژەی خاچی بەسەر سینگیداکێشا:

" خوا بیپارێزێ."

ماركیز راستییەکەی پێگوت. لە باسکردنی رووداوەکەدا زۆر لەسەر هەست بوو، چونکە بێرناردا ئارەزووی دەکرد وەك مردووان هەڵسوکەوت لەگەڵ سییەرڤا ماریای بکرێ،.بۆیە لە کاتی خۆیدا ئەوی ئاگادار نەکردەوە. بێرناردا بێ ئەوەی چاو بتروکێنێ بە وردبینییەکی تایبەتییەوە، کە لە ماوەی دوازدە ساڵ ژیانی هاوبەشدا وێنەی نەبووە، گوێی بۆ قسەکانی راگرت.

ماركیز گوتی:" دەمزانی بە مەرگی خۆم نرخی بوونی وی دەدەم"

بێرناردا ئاخێکی هەڵکێشا:" واتە ئابڕوو چوونەکەمان ئاشکرا بووە." ئەو بریسکانەوەی فرمێسکێکی لە چاوی هاوسەرەکەیدا دیتو لە ناخەوە لەرزی لێهات. ئەم جار نەك مەرگ، بەڵکوو ویژدانی حاشاهەڵنەگری کەسێك بوو کە درەنگ یان زوو وەخەبەر دێ. بێرناردا بە هەڵە نەدەچوو. ماركیز بە هەموو توانایەوە لە جۆلانەی هاتە خوار، لەبەرامبەر بێرناردایدا تێك شکاو وەك پیرە پیاوێکی پەك کەوتە دەستی کرد بە گریانو نووکەنووکێ. ئەو لەبەرامبەر ئەو فرمێسکە پیاوانەیەدا کە رووپۆشەکەی دەسووتاندو هەتا سەر رانیی دەچوو، تەسلیم نەبوو." بێرناردا پیی لەسەر ئەوە داگرت کە زۆر لە سییەرڤا ماریای بێزار بوو، بەڵام ئەگەر لە ژیاندا بمێنێتەوە، پێی خۆشە.

ئەو گوتی:" ئەمن هەمیشە سەر لە هەموو شتێك دەردێنم جگە لە مەرگ."

بێرناردا دیسان خۆی بە تلتەو کاکاتۆوە زیندانی کرد. کاتێك پاش دوو حەوتووان هاتە دەر ببوو بە مردوویەکی جووڵاو. ماركیز بەیانیی زوو شتێکی لە بارەی کاردروستایەتیی سەفەرەوە بیستو زۆری گوێ پێ نەدا. بەر لەوەی گەرمای هەتاو زیاتر بێ، چاوی بە بێرناردا کەوت کە بە سواری ئێسترێکی دەستەمۆکراو لە دەروازەی ماڵێ دەچێتە دەرو حەیوانێکی بارکێش بە توێشووی سەفەرەوە بەدوایەوە بوو. بێرناردا زۆر جار بەبێ ئێسترو کۆیلە، و بێ ئەوەی ماڵاوایی لەکەس بکا یان هیچ شتێك بەکەس

بلێ، لە ماڵێ چووبووە دەرەوە. ئەمجار مارکیز دەیزانی کە ئەو دەڕوا بۆ ئەوەی نەگەڕێتەوە، چونکە لە پەنا جانتا هەمیشەییەکانی دوو گۆزەی سواڵەتی پڕ لەو زێڕانەی کە ساڵانێك لەژێر تەختی خەوەکەی خۆی حەشاری دابوون، لەگەڵ خۆی دەبردن.

مارکیز دەستەوەستانو بێ دەسەڵات لە نێو جۆلانە دا بوو، دیسان ترسی کوژران بە دەستی کۆیلەکانی بەسەردا زاڵ بوو. ئەو ڕۆژەی هاتنی ئەوانی بۆ ماڵێ قەدەغە کرد. کایەتانۆ کە وەدوای جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئۆسقۆف کەوتبوو، دەبوو پاڵی بە دەرگاوە نابایەو نەخوازراو وەژووریَ بکەوێ، چونکە کەس وەڵامی لێدانی ئالقەی دەرگای نەدەدایەوە. سەگەکان لە قەفەسەکانیاندا حەجمینیان نەبوو، بەڵام ئەو ڕێگای خۆی درێژە پێ دا.

مارکیز لە نێو جۆلانەی نێو باغدا بە باڵاپۆشێکی بەکڵاوەی سارا سینایی‌و ژێر کراسێکی تولەدوورییەوە لە حاڵێکدا هەموو لەشی بە شکۆفەی پرتەقاڵێ داپۆشرابوو، خەریکی پشووی دوانیوەڕۆیە بوو. دیلاڤرا بێ ئەوەی وەخەبەری بێنێ سەیری کرد. دەتگوت سەیری سییەرڤا ماریای دەکا، تێکشکاوو دەستەوەستان لە تەنیاییدا. مارکیز وەخەبەر هاتو لەبەر چاوبەندەکەی، زوو ئەوی نەناسیەوە. دیلاڤرا بە نیشانەی هێمنایەتی دەستەکانی بە کراوەیی بەرز کردنەوە.

ئەو گوتی:

" خوا ئاگای لێت بێ بەڕێز مارکیز، چۆنی؟"

مارکیز گوتی:" باش، خەریکە دەرزم."

بە دەستی خەواڵووەوە پەردە تۆڕەکەی پشووی پاشنیوەڕۆیەی لا دا لەسەر جۆلانە دانیشت. کایەتانۆ سەبارەت بەوەی بێ بانگهێشتن هاتۆتە ماڵێ، داوای لێبووردنی کرد. مارکیز بۆی باس کرد کە کەس گوێ بە دەنگی دەرگایە نادا، چونکە ڕەسمی میوانداری لە میوانان لەبیر کراوە. دیلاڤرا بە راوێژێکی ئاقڵانەوە دوا:" پایەبەرز ئۆسقۆف کە زۆر سەرقاڵەو نەخۆشیی ڕەبۆشی هەیە ئەمنی بە نوێنەرایەتی لە لایەن خۆیەو ناردوە."

کاتێك رازیبوونێکی سەرەتایی بەدەست هێنا، لە پەنا جۆلانە دانیشت دەرفەتێکی باشی بۆ هەڵکەوت باسی ئاگرێك بکا کە لە ناخەوە دەی سووتاند.

" دەمەوێ پێت رابگەیەنم کە بەرپرسایەتیی ساغیی رووحی کچەکەتیان بە من ئەسپاردوە."

مارکیز سوپاسی کردو دەیەویست بزانێ کچەکەی چۆنە.

دیلاڤرا گوتی:

" باشە. بەڵام دەمەوێ یارمەتیی بکەم چاکتر بێتەوە."

بۆی باسی هەستو شێوەی دژایەتیی شەیتان کرد، باسی توانایەکی کرد کە مەسیح بە لاوەکانی بەخشیوە تاکوو رووحی جندۆکەو شەیاتین لە لەشەکان دەربکاو سلامەتی بە داماوەکان ببەخشێتەوە. تەوراتو دوو هەزار شەیتانی سواری بەرازانی بە نموونە هێنایەوە. کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە دەبێ لە پێشدا بیسەلمێنی، داخوا بەراستی شەیتان چۆتە لەشی سییەرڤا ماریاوە. ئەو باوەڕ ناکا، بەڵام پێویستیی بە یارمەتیی مارکیز هەیە بۆ ئەوەی هەرچەشنە شکو گومانێك بڕەوێنێتەوە. ئەو گوتی، بەر لە هەموو شتێك دەیەوێ بزانێ، کچۆڵە بەر لەوەی بێتە پەرستگە چۆن بوو.

مارکیز گوتی:" نازانم، وام دەهاتە بەرچاو هەرچی زیاتر لەگەڵی ئاشنا دەبوون، کەمتر سەر لیدەردەکرد."و سەبارەت بەوەی کچۆڵەیان لە دالانی کۆیلەکان بەرەڵلا کردبوو، هەستی بە گوناح دەکرد. چەندین مانگی پێویست بوو تاکوو کچۆڵە بێتەوە سەرخۆی. کچۆڵە بە فێڵو گاڵتەی نامەنتیقی دایکی تووڕە دەکردو ئەو زەنگوڵەی بە جمگەی دەستییەوە بوو لە ملی پشیلەی دەکرد. کۆسپی سەرەکیی ناسینی کۆڵەی خووگرتنی خراپی وی بە درۆیان بوو.

دیلاڤرا گوتی:" راست وەك رەشپێستان."

مارکیز گوتی:" رەشپێستەکان درۆیان لەگەڵ ئێمە دەکەن نەك لەگەڵ خۆیان."

دیلاڤرا لە ژووری خەوی کچۆڵەیدا بە سەیرکردنێك نەیدەتوانی ژمارەیەکی زۆر کەلوپەلی پێویستی دایەگەورەی لە شتە نوێیەکانی سییەرڤا ماریا جیا بکاتەوە. بووکەڵەی جولاو، سەماکەری قورمیشی، سەعاتی یاری. سەر نوێنان جانتایەکی بچووکی لیبوو کە مارکیز ئامادەی کردبوو تاکوو لەگەڵ خۆی بەرێتە پەرستگە. راوەکەیەکی تۆز لێنیشتوو لە گۆشیەك کەوتبوو. مارکیز بۆی باس کرد کە ئەوە ئامێرێکی ئیتالیایی لەکارکەوتووی مۆسیقایە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئیستیعدادی منداڵەکەی لە لیدانی ئەو ئامێرە مۆسیقایەدا پەروەردە دەکرد. بە پەرێشانیەوە خەریکی قورمیشی ئامێرەکە بووو هەروا بە بیری خۆی نەك هەر چاکی لیدەدا، بەڵکوو تەنانەت لە گۆرانییەکی هەڵکرد کە لەگەڵ سییەرڤا ماریا دروستی کردبوو.

ئەم کاتە زۆر شتی دەردەخست. مۆسیقا ئەو شتانەی بە دیلاڤرا دەگوت کە مارکیز نەیدەتوانی لە بارەی کچەکەیدا بیان درکێنێ. مۆسیقا بە چەشنێك کاری تێکرد کە نەیتوانی تا کۆتایی درێژەی بدا. ئاخێکی هەڵکێشا:

" ئەتۆ ناتوانی بیری لیبکەیەوە کە چەندی کلاو لێجوان بوو."

دیلاڤراش هەستی وەجۆش هات.

" دەزانم کچت زۆر خۆش دەوێن."

مارکیز گوتی:" وایە، ئەمن گیانم دەبەخشم تاکوو بتوانم بیبینم."

دیلاڤرا جارێکی دیکە هەستی بەوە کرد کە خوا چووکەترین شتەکانیشی لێناشارێتەوە.

ئەو گوتی:" ئەگەر بتوانم بیسەلمێنم کە شەیتان نەچۆتە نێو لەشیەوە، ئەمە ئاسانترین داوایە."

مارکیز گوتی:" لەگەڵ ئابرێ نۆنچیکۆ قسان بکە، ئەو هەر لەسەرەتاوە گوتی کە سییەرڤا ماریا ساغەو هەر ئەویش دەتوانێ روونی بکاتەوە."

دیلاڤرا ئەوەی لەبەر زەحمەت بوو. ئابرێ نۆنچیکۆ نەیدەتوانی بۆ وی بەکەڵك بێ، بەڵام وتووێژ لەگەڵ وی رەنگ بوو ئاکامێکی باشی نەبێ. وادیار بوو مارکیز فکری ئەوی خوێندۆتەوە.

گوتی: ئەو پیاوێکی یەکجار باشە."

دیلاڤرا سەری بە شێوەیەکی وتادار لەقاند.

ئەو گوتی:" ئەمن فایلەکانی ئیدارەی ناوچەی ئۆسقۆف دەناسم."

مارکیز بەربەرەکانیی کرد:" هیچ قوربانییەك ئەوندە گەروە نیە کە بمانەوێ لە مردنێی راست کەینەوە." و کاتێ دژکردەوەیەکی لە دیلاڤراوە ندی قسەکەی تەواو کرد:

" بۆ خاتری خوای دلۆڤان، تکات لێ دەکەم."

دیلاڤرا بە دڵێکی زامدارەوە گوتی:

" لەبەرت دەپارێمەوە. مەیەڵە ئەوەندە ئازار بچێژم."

ئیدی مارکیز دەستی هەڵگرت. ئەو جانتا بچووکەکەی لەسەر نوێنان هەڵگرت‌و داوای لە دیلاڤرا کرد بیداتە کچەکەی.

ئەو گوتی:" لانی کەم دەزانێ ئەمن لە فکری وی دام."

دیلاڤرا بەبێ ماڵاوایی تێی تەقاند. لەبەر ئەوەی بارانێکی بەخوڕ دەباری، جانتایەکەی وەبن عەبایەکەی دا، زۆر بە چاکی ئاگای لێ بوو. پاش ماوەیەکی بەخۆی زانی کە دەنگی دەروونی دێڕ بە دێڕی ئاوازی تینۆربەی بە ئارەنار دەڵێ. باران سەروسەکوتی دەکوتا کە بە دەنگی بەرز تێی هەڵکردە گۆرانی‌و لە بیری خۆیدا هەتا ئاخیرێی گوت. بە گۆرانی گوتنەوە بەرەو گەڕەکی خاوەن پیشەکان وەرسوورِا، بە تەنیشت ئۆرکێسترای زیارتکەراندا بۆلای چەپ رۆیشت‌و تەقەی لە دەرگای ماڵە ئابرێ نۆنچیکۆ هێنا.

پاش بێدەنگییەکی زۆر دەنگی پێیانی بیست کە بەسەر عەرزی دا کشان. دەنگێکی خەوالوو لێی پرسی:

" کێیە؟"

دیلاڤرا گوتی: " قانوون."

بۆ ئەوەی ناوی خۆی نەدرکێنێ، شتێکی دیکەی بە مێشکیدا نەهات.

ئابرێ نۆنچیکۆ بەو خەیاڵە کە بەراستی نێردراوانی دەوڵەتن دەرگای کردەوە. ئەوی نەناسی. دیلاڤرا گوتی:" ئەمن بەڕێوەبەری کتێبخانەی ئیدارەی ناوچەی نۆسقۆفم." پزیشك ڕێگای بەرەو دەرگای چوونە ژووری دالآنی تاریك پێ نیشان داو یارمەتیی دا تاکوو رووپۆشە تەڕەکەی داکەنێ. بە شێوەی خۆی‌و بە لاتینی پرسی:

" لە چ کوشتارێکیدا چاوت لە دەست داوە؟"

دیلاڤرا بە زمانی لاتینیی سەردەمی قوتابخانەی خۆی، باسی پێشهاتی ناخۆشی رۆژگیرانی کردو بە دوورودرێژی باسی نەخۆشییە سەرسەختەکەی بۆ کرد کە پزیشکی نۆسقۆف تەئکیدی کردبوو چاوبەند شتێکی پێویستە. بەڵام ئابرێ نۆنچیکۆ تەنیا سەرنجی دابووە پاراویی زمانە لاتینییەکەی.

بە سەرسوڕمانەوە گوتی: " ئەوە ئەو پەڕی پێگەیشتووییە. لە کوێ فێر بووی؟"

دیلاڤرا گوتی:" لە ئاڤیلا."

ئابرێ نۆنچیکۆ :" خزمەتێکی چەندە گەورە."

ئەو دەرفەتی پێ دا تاکوو دیلاڤرا کەوشە تەختەکانی‌و رووپۆشەکەی داکەنێ، جل‌وبەرگە تەڕەکانی دابنێ‌و لە پەنا رووپۆشەکە بیانهاوێتە سەر پانتۆڵەکە. پاشان چاوبەندەکەی لابرد و هاویشتیە نێو زبڵدانێکەوە. ئەو گوتی:" نەخۆشیی چاوی تۆ ئەوەیە زیاتر لەوەی کە دەبێ ببینێ، دەبینێ."

دیلاڤرا شەیدای ئەو هەمووە کتێبانە بوو کە لە ژوورێ لەسەریەك دانرابوون. ئابرێ نۆنچیکۆ هەستی بەوە کرد و ئەوی بەرەو ژووری یارمەتییە سەرەتاییەکانی پزیشکی برد کە شوێنێك بوو کتێبێکی زۆر لە جێ کتێباندا هەتا بن میچی لەسەر یەك دانرابوون.

دیلاڤرا هاواری کرد:" یا رووحی پیرۆز! ئەمە کتێبخانەی پێترارکایە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" نزیکەی دووسەد بەرگ زیاتر."

دەرفەتی پێ دا بە گوێرەی حەزی خۆی دەستیان پێدا بگێڕێ. کتێبی نۆنیکا لەوێ بوو کە لە ئیسپانیا وەك حوکمی زیندان سەیری دەکرا. دیلاڤرا ناسی، بە ئۆگرییەوە پەڕی هەڵدانەوە بە دڵێکی پڕەوە لە جێی کتێبانی دانایەوە. بەرەو ژوورتر لە پەنا کتێبی نەمری ترسی لەبەر

دلاندا کۆمەڵـە بەرهـەمی ڤـۆلتێری بـە زمـانی فەڕانـسەیی و وەرگێڕانێکـی لاتینیـی نامـە فەلسەفییەکانی دیت.

بە گاڵتەوە گوتی:" ڤۆلتێر بە زمانی لاتین، ئەمە شتێکە تا سنووری لەدین وەرگەڕان."

ئابرێ نۆنچیکۆ بۆی باس کرد کە راهیبێکی خەڵکی کوبرا ئەوەی وەرگێڕاوە. ئەو پۆشـتە بوو و بۆ خۆشیی زیارەتکەران کتێبی دەگمەن دەگمەنی چاپ دەکردن. کاتێك دیلاڤرا خـەریکی هەڵدانەوەی پەڕان بوو، پزیشك لێی پرسی داخوا زمانی فەرانسەیی دەزانێ؟

دیلاڤرا بە لاتینی گوتی:" قسەی پێ ناکەم بەڵام پێی دەخوێنمەوە." و بێ ئـەوەی شـەرم بکـا لـە خۆڕا گوتی:" دیارە یۆنانی، ئینگلیزی، ئیتالیایی، پورتوگالیو کەمێکیش ئەڵمانی."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" پرسیاری من سەبارەت بە سەرنجی رەخنەگرانەی تۆ بەرامبـەر بـە ڤۆلتێرە. ئەمە کۆمەڵەیەکی تەواوە."

دیلاڤرا گوتی:" ئەو زۆر جار ئێشو ژانی بۆ ئێمە هەموار دەکرد. مخابن ئـەم شـێعرانە ئـی فەڕانسەییەکن."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" ئەتۆ ئەم قسەیەی دەکەی چونکە ئیسپانیایی."

دیلاڤرا گوتی:" بەو هەمووە خوێنە تێکەڵاوەوە لەم تەمەنەدا ئیـدی دەقیـق نـازانم کـێمو سەربەکوێم."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" لەم وڵاتە بەرینەدا هیچ کەس نازانێ. ئەمن پێم وایە سـەدان سـاڵ دەبێ بڕوا تاکوو بیزانین."

دیلاڤرا بێ ئەوەی چاو لە لەسەر کتێبخانە هەڵبگرێ قسەی لەگەڵ دەکرد. لەپڕ شتێك کە زۆر جـار لێی روو دەدا، کەوتەوە بیری ئەو کتێبەی کـە لـە تەمـەنی دوازدە سـاڵیدا بەڕێوەبـەری قوتابخانەکـەی خوێندنەوەی لێ قەدەغە کردبوو و ئەو تەنیا بەشێکی بـچووکی لـەبیر بـوو، وبەدرێـژایی تەمـەنی بـۆ ئەوەی کتێبەکەی ببینێتەوە، دەگەیشتە هەرکەس ئەو بەشەی دووپاتە دەکردەوە.

ئابرێ نۆنچیکۆ لێی پرسی:" ناوی کتێبەکەت وەبیر نایەتەوە؟"

دیلاڤرا گوتی:" قەت ناویم نەزانی، بۆ زانینی کۆتایی کتێبەکە ئامادەم دەست لە هـەموو شتێك هەڵگرم."

پزیشك بێ ئەوەی ئاگاداری بکا کتێبێکی لە پێش چاوی راگـرت، کـە دیلاڤـرا بـە یەکـەم چاولێکردن ناسیەوە. ئەم کتێبە یەکێك لەو چوار بەرگ کتێبە کۆنەی ئامادیس بوو لـە لایـەن گالیینەوە بوو کە لە شاری سە ڤیلا چاپ ببوو. دیلاڤرا بە وردی سەیری کـرد. ئـەو لـەرزی هاتبۆیـەو

دەیزانی کە زۆری نەماوە بەبێ ڕێگای دەربازبوون نابوود دەبێ. سەرەنجام باوەڕبەخۆبوونی خۆی وەدەست هێنایەوە:

" دەزانی ئەم کتێبە قەدەغەیە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" هەروەك باشترین ڕۆمانەکانی ئەم سەدەیە، و لە جیاتی ئەم کتێبانە، ئێستاش تەنیا نامە بۆ تەڵەبان چاپ دەبن. خەڵکی داماوی ئەم سەردەمە ئەگەر نەتوانن ڕۆمانەکانی شوڤالیە بخوێننەوە، ئەدی دەبێ چ بخوێننەوە؟"

دیلاڤرا گوتی:" کتێبی دیکەش هەن. سەد نوسخە لە یەکەم چاپی دۆن کیشۆت، لێرە هەر لە چاپی یەکەمدا خوێندراونەتەوە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" نەخوێندراونەتەوە، ئەوانە بۆ وڵاتانی دیکە بە گومرکێدا ڕەت بوون.

دیلاڤرا سەرنجی نەدەدا قسەکانی، بەڵام نوسخەی بە نرخی ئامادیسی بەرهەمی گالیینی ناسیەوە.

ئەو گوتی:" ئەم کتێبە نۆ ساڵ لەوەپێش لە بەشی نهێنیی کتێبخانەی ئێمە بزر بووەو قەت ناسەوارێکمان لێ نەدیتەوە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" بیرم لێ دەکردەوە، بەڵام هۆی دیکە هەن کە ئەم کتێبەی بە نوسخەیەکی مێژوویی بزانن: لە ماوەی زیاتر لە ساڵێکدا لانی کەم لە نێوان یازدە کەسدا دەستاودەست کراوە،و لانی کەم سێ کەسیان نەماون. لەو بارەیەوە بە تەواوی دڵنیام."

دیلاڤرا گوتی:" ئەمە ئەرکی سەرشانمە بە ئیدارەی ناوچەی ئۆسقۆفت بناسێنم."

ئابرێ نۆنچیکۆ قسەکەی بە جیدی وەرنەگرت.

" قسەیەکی مورتەدانەم کرد؟"

" ئەوەم گوت، چونکە کتێبی قەدەغەکراوت هەن کە پێوەندییان بە تۆوە نیەو پێت ڕانەگەیاندوون."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" وێڕای ئەمە زۆر کتێبی دیکەشم هەن." و بە قامکی ئاماژەی بە بازنەیەکی گەورەی قەفەسەی پڕ لە کتێبانی کرد. " بەڵام ئەگەر وایە، ئەوکات تۆ دەبوا زۆر لە ئێستا زووتر هاتبای منیش دەرگام لێنەدەکردیەوە." ڕووی تێکرد و بە ڕووخۆشییەوە درێژەی دا:" بەڵام خۆشحاڵم سەبارەت بەم گفتوگۆ شیرینە لێرەت دەبینم."

دیلاڤرا گوتی:" مارکیز کە نیگەرانی کچەکەیەتی داوای لێکردم بێمە ئێرە."

ئابرێ نۆنچیکۆ داوای لێکرد بەرامبەری دانیشێ: کاتێك تۆفانی ماڵوێرانکەر دەریای سەروبن دەکرد، ئەو دووانە بە پێچەوانەی عادەت ئامادە بوون گفتوگۆ بکەن. پزیشك بە زیرەکیو بە زانایی بۆی باسی هاری کرد هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە تا ئەمڕۆ، ئەو باسی سوودلێوەرگرتنی بە بێ

سزاو دەستەوەستانیی هەزارساڵەی توانا پزیشکییەکانی کرد کە بوونەتە کۆسپی سەر ڕێگەی پێشکەوتن. ئەو نموونەی جێی داخ و پەژارەی لەم بارەیەوە خستنە ڕوو کە لە کۆنەوە ئەم نەخۆشییەیان لەگەڵ شەیتان لێدراوی و شێوەیەکی تایبەتی لە شێتی و شێوەی جۆراوجۆری ئاڵۆزیی رووحی لێ تێك چووە. ئەوەی پێوەندیی بە سییەرڤا ماریاوە هەبوو، بە دووری دەزانی کە پاش تێپەڕینی سەدوپەنجا ڕۆژان هێشتا هەر نەخۆش بێ. ئابرێ نۆنچیکۆ لە کۆتاییدا گوتی:" ئەم مەترسییە لە گۆڕێدا هەیە کە کچۆڵە وەك زۆر کەسی دیکە بەهۆی وەحشیگەری لە دژایەتیی شەیتاندا گیانی خۆی لەدەست بدا."

ڕستەی دوایی بە بۆچوونی دیلاڤرا زیاتر وەك موبالەغەی تایبەتیی پزیشکانی سەدەکانی نێوەڕاست دەچوو، بەڵام دژایەتیی نەکرد، چونکە ئەم موبالەغەیە زۆر چاك لەگەڵ ئیستیدلالە مەزهەبییەکەی یەکی دەگرتەوە کە پێی وانەبوو کچۆڵە شەیتان لێدراوە. ئەو گوتی زانینی سێ زمانی ئیسپانیایی، پورتوگالی و زمانە جۆراوجۆرەکانی ئەفریقایی بۆ سییەرڤا ماریا بە پێچەوانەی ئەوەی لە پەرستگە لەسەریان نووسیوە، هیچ کات فریوی شەیتان نیە. بۆ ئەم مەبەستە بەڵگەیەکی زۆر هەیە کە کچۆڵەکە هێزێکی رووحیی بەرچاوی هەیە، بەڵام هیچیان ناڵێن ئەو پێوەندیی بە هێزێکی ناسروشتییەوە هەیە. تەنانەت نیشانەیەکی روون لە هەڵفڕین یان پێشگۆیی ئەو دوو دیاردەیەی کە هەمیشە بەڵگەی هەبوونی پیرۆزی بە حیساب دێن، لەبەر دەستدا نیە. سەرەڕای ئەمەش دیلاڤرا هەوڵی دا پشتیوانیی برایانی دیکەی هاوبیر وبۆچوونی خۆی لە ناوچەکانی دیکەش بەدەست بێنێ، بەڵام هیچیان نەیان وێرا لە دژی فایلەکانی پەرستگە قسەیەك بکەن، یان لەبەرامبەر بە باوەڕهێنانی خێرای خەڵکی راوەستن. ئەو باش دەیزانی کە نە داوەریی ئەو و نە ئی ئابرێ نۆنچیکۆ و نە داوەریی هەردووکیان پێکەوە بتوانێ قەناعەت بە کەسێك بێنێ.

ئەو گوتی:" کەوابوو هەردووکمان لەگەڵ هەمووان ناکۆکین."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" هەر بۆیە هاتنی تۆم پێ سەیر بوو. ئەمن جگە لە پارووپەکی راوێ، لە راوگەی دادگای پشکینیی بیروباوەڕدا شتێکی دیکە نیم."

دیلاڤرا گوتی:" لە راستیدا بۆخۆشم نازانم، بۆ هاتووم. دەڵێی ئەو بوونەوەرە لەلایەن خواوە ئەرکی ئەوەیە تاکوو هێزی ئیمانم بەتاقی بکاتەوە."

دەربڕینی ئەم ڕستەیە، ئەوی لە فشاری هەناسەی لە سینگدا قەتیس کراو رزگار کرد. ئابرێ نۆنچیکۆ بە سەیرکردنی چاوەکانی قووڵایی رووحی ئەوی دیت و زانی کە دیلاڤرا زۆری نەماوە دەست بکا بە گریانێ.

ئەو بە راوێژێکی ئارام بەخشەوە گوتی:" لەخۆڕا فشار بۆخۆت مەهێنە، رەنگە لەبەر ئەوەی تۆ دەبووا لە بارەی کچۆڵەکەدا قسەت بکردایە، هاتوویەتە ئێرە."

دیلاڤرا خۆی وەك رووتان هەست پێ‌کرد. لە جێی خۆی راست بۆوە، بەدوای رێگەیەکی چوونەدەردا گەڕا بەڵام رای نەکرد، چونکە هەموو جلوبەرگەکانی لەبەردا نەبوو. ئابرێ نۆنچیکۆ یارمەتیی دا تاکوو جلوبەرگە نیوە تەڕەکانی لەبەر بکاتەوە، و هەوڵی دا نەیەڵێ بڕوا تاکوو بتوانن درێژە بە قسەکانیان بدەن. ئەو گوتی:" ئەمن دەتوانم هەتا ساڵێکی دیکەش بێ پسانەوە لەگەڵت بدوێم." هەوڵی دا بە شووشەیەکی چووکە کە گیراوەی شووشتنەوی قەرنیەی چاوی تێدابوو تاکوو برینە خۆڕاگرەکەی پێ چارەسەر بکا، پێش بە رۆیشتنی بگرێ. ئەوی لە بەردەرگا ڕا گێڕایەوە تاکوو جانتا چووکەکەی لە ژووری لێ بەجێ مابوو، دەست داتێ. وادەهاتە بەرچاو کە دیلاڤرا تووشی دەردێکی کوشندە بووە. ئەو سەبارەت بە وتووێژی پاشنیوەڕۆیە، یارمەتییە پزیشکییەکانو گیراوەی چاو سوپاسی لێ‌کرد، بەڵام ئیزنی نەدا بۆچوونی خۆی بگۆڕێو بەڵێنی دا جارێکی دیکە بۆ چاوپێکەوتنی بێتەوە. ئەو نەی دەتوانی لەوە زیاتر لەبەرامبەر ئارەزووی دیتنی سییەرڤا ماریادا خۆی راگرێ. تەنانەت لە شەقام نەی زانی شەو داهاتوە. ئیدی باران نەدەباری بەڵام جۆگەکان لەبەر بارانی زۆر پڕ ببوون. دیلاڤرا بە زەحمەت بە رێگادا دەڕۆیشت، ئاو لە نێوەڕاستی شەقامێ هەتا گوێزینگی دەهات. ژنی کێشکچی هەوڵی دا رێی پێ بگرێ، لەبەری ئەوەی زۆری بۆ زایەڵەی ناقووسی شەوێ نەمابوو. دیلاڤرا پاڵی پێوەنا:

" ئەمە ئەمری پایەبەرز ئۆسقۆفە."

سییەرڤا ماریا لە ترسان وەخەبەر هاتو لە تاریکیدا ئەوی نەناسیەوە. ئەو نەیدەزانی چۆن پێی بڵێ بۆچی لەم کاتە نائاساییەدا هاتوە، لەپڕ بیانوویەکی دۆزیەوە:

" باوکت دەیەوێ بتبینێ."

کچۆڵە جانتا چووکەکەی ناسیەوەو دەموچاوی لە تووڕەییان سوور هەڵگەڕا.

ئەو گوتی:" بەڵام ئەمن نامەوێ."

بە سەرسوڕماوییەو لێی پرسی، بۆ.

کچۆڵە گوتی:" هەروا. باشترە بمرم."

دیلاڤرا هەوڵی دا بەندی قایشی گوێزینگی لاقە ساغەکەی بکاتەوە، پێی وابوو ئەم کارەی دەبێتە هۆی خۆشحاڵیی وی.

کچۆڵە گوتی :" لیم گەڕێ. دەستم لێ مەدە."

دیلاڤرا قسەکەی بە هێند وەرنەگرت،و کچۆڵە بە تووڕەییەوە تفی لە دەموچاوی کرد. ئەو خۆی راگرتو لاروومەتەکەی دیکەی بۆ راگرت. سییەرڤا ماریا دیسان تفی لێ کردەوە. ئەو سەرمەست لە لووتکەی تامو چێژی قەدەغەکراودا لە کە ناخیەوە بلێسەی سەندبوو، دیسان لاروومەتەکەی دیکەی هێنایەوە پێشێ. چاوەکانی لەسەریەك دانانو لە ناخی دڵەوە دەستی بە دوعا کرد. هاوکات کچۆڵە بەردەوام تفی دەکردو هەتا زیاتر دەرهەڵبوویایە، دیلاڤرا پتری پێ خۆش بوو، تاکوو کچۆڵە بۆی دەرکەوت کە تووڕەبوونەکەی چەندە بێ سوودە. ئینجا دیلاڤرا شانۆی ترسناکی مرۆڤێکی بەراستی تووڕەی دیت. مووەکانی سییەرڤا ماریا قرژ بوونو وەك زیندووان بوون بە ماری مێدۆزاو کەفی لە زاری دەهاتو بە زمانی بتپەرستان وەبەر رەهێڵەی جنێوانی دا. دیلاڤرا وێنەی مەسیحی لەخاچدراوی دەرهێنا، لە روخساری کچەی نزیك بۆوەو هاوارێکی ترسناکی کرد: " کەیفی خۆتە کێی کێ نی، هەی شایانی دۆزەخ، برۆ ون بە."

هاواری وی ئەوەندە هاندەر بوو کە کچۆڵە تەفریبەن هەموو قایشەکانی پچڕاندن.

ژنی کێشکچیی ژوورێ بە نیگەرانییەوە گەیشتێو هەوڵی دا لغاوی بکا. بەڵام تەنیا مارتینسا بوو توانی بە هەستی ئاسمانیی خۆی دەرەقەتی ئەم کارە بێ، دیلاڤرا رایکرد.

ئۆسقۆف لە کاتی نانخواردنی شەوێدا بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی ئەو بوو، چونکە بۆ خوێندنەوە ئامادە نەببوو. بۆ وی روون کە دیلاڤرا لە دنیای خۆی دایە، جگە لە دیمەنی وەحشیی سییەرڤا ماریای کۆڵەوار، ئاگای لە دنیاو قەیامەتێ نەماوە. دیلاڤرا خۆی دە کتێبخانە هاویشت، بەڵام نەی دەتوانی بخوێنێتەوە. بە باوەڕێکی تاڵەوە نوێژی کرد، وێڕای تینۆرییەی گۆرانیی گوت. وەك رۆنی داغ وەها فرمێسکی هەڵدەوراندو دەتگوت ئاگر لە دەروونی هەڵ دەستێ. ئەو جانتا بچووکەکەی سییەرڤا ماریای کردەوەو شتومەکەکانی یەك بەیەك لە سەر مێزەکەی ریز کردن. ناسینیەوە، بە هێزێکی پڕ لە ئەوینەوە بۆنی کردنو خۆشی ویستنو بەوپەڕی بێ شەرمیەوە قسەی لەگەڵ دەکردن. پاشان هەتا نێو قەدی خۆی رووت کردەوە، شێلاقێکی ئاسنی لە چەکمەجەی مێزە گەورەکەی دەرێنا کە تا ئەوکاتە نەیوێرابوو بیهێنێتەدەرو بە تووڕەییەکی هەوسارداماڵراوەوە، بێ ئەوەی تۆزقاڵێك راوەستێ، وەرگەڕایە خۆی تاکوو دواین نیشانەکانی سییەرڤا ماریای لە گیانی خۆی بسڕێتەوە. ئۆسقۆف کە هەروا چاوەڕوانی وی بوو، ئەوی لە حاڵێکدا دیتەوە کە شەڵاڵی خوێنو فرمێسك ببوو.

دیلاڤرا گوتی:" باوکی بەڕێز، ئەو شەیتانە، خراپترین جۆریەتی."

# ٥

ئۆسـقۆف دیلاڤـرای بـانگ کـرده ژووری خـۆی تـا وەڵام بداتـەوەو بـەبێ چاوپۆشـی گـوێی بـۆ ددانپێداهێنانی بێپەردەو تەواوی ئەو گرت، باش دەیزانی کە نابێ لێی خۆش بێ، بەڵکوو دەبێ بڕیـاری دادگای بەڕێوە بەرێ. تەنیا خاڵێکی لاواز کە لەبەرامبەر دیلاڤرادا لـە خـۆی نیـشاندا ئـەوە بـوو کـە هەڵـەی واقعیـی ئـەوی بـە نهێنـی هێـشتەوە. هـەموو مـافو بەرپرسـایەتییەکانی بـەبێ هـیچ شیکردنەوەیەکی ئاشکرا لێ ئەستاندەوەو ناردیـە نەخۆشـخانەی ئـاموردی دیـووس تـاکوو لـەوێ وەك پەرستاری گولان ئەرکی خۆی بەڕێوە بەرێ. دیلاڤرا تکای کرد بۆ تەسکینی دڵی خۆی ئیزنی بدا نوێـژی سەعات پێنجی ئێوارە بۆ گولەکان بکا، بەڵام ئۆسقۆف ئیزنی نەدا. دیلاڤرا بەهەسـت بـە بۆشـاییەکی قووڵ چۆکی لەسەر عەرزیدا داو هەردووکیان پێکەوەخەریکی نزا بـوون. ئۆسـقۆف دوعـای خێـری بـۆ کردو یارمەتیی دا هەستێتە سەر پێ.

ئۆسقۆف گوتی:" خوا ڕوحمت پێ بکا." و ئەوی لە دڵی خۆی سڕیەوە.

تەنانەت پاش ئەوەش کە کایەتانۆ سزایەکەی تێپەڕ دەکرد، زۆر لە کاربەدەستانی سـەرووی نیدار پشتیوانییان لێکرد، بەڵام ئۆسقۆف دڵی نەرم نەبوو. ئەو ئەو بۆچوونەی ڕەت کردەوە کە ئەوانەی شەیتان دەردەکەن سەرەنجام هەر لەلایەن ئەو شەیتانانەوە کە دەریـان کـردوون لـە داو دەکەون. دوایین ئیستیدلالی وی ئەوە بوو کە دیلاڤرا گوێی بە بڕیـاری لێبراوانـەی مەسـیحیانە نەداوە، بەڵکوو سەرپێچیی لێکردوەو دانیشتوەو باسی مەسەلە ئایینییەکانی لەگەڵ کـردوون. ئۆسقۆف گوتی:" هەر ڕاست ئەوە زەبری لـە ڕووحـی دیلاڤـرا داوەو هـەتا سـنووری لـە دیـن وەرگەڕانی بردوە." ئەوەی لە هەموو شت زیاتر جێی سەرسوڕمان بوو، ئەوە بوو کـە ئۆسـقۆف لەگەڵ کەسێکی باوەڕپێکراوی خۆیدا ئـاوا دڵڕەقانـە ڕەفتـاری دەکـرد، ئـەویش سـەبارەت بـە گوناهێك کە کەفارەتەکەی ئەوپەڕی لە حەددی مۆمە سەوزەکان تێ نەدەپەڕی.

سییەرڤا بە چاوپۆشییەکی تایبەتیەوە مارتینای وەرگرت. لەو کاتەدا مارتیناش سـەبارەت بە ڕەتکرانەوەی داوای لێبووردنی، زۆر غەمگین بوو. کچۆڵە لە شـتێك نەگەیـشت، تـاکوو لـە

پاشنیوەڕۆیەکیدا لە کاتی میلدۆزیدا لەسەر بالکۆن، چاوی لە سەری کردو دیتی فرمێسک بە چاوی مارتینادا دێنە خوار. ئەو دوودلیی خۆی لە سییەرڤا ماریا نەشاردەوە:

" پێم خۆش بوو بمرمو ئیدی لەنێو ئەم زیندانەدا لە سەگەمەرگیدا نەدەبووم."

گوتی تەنیا هیوای بۆ هەلس‌وکەوت لەگەل سییەرڤا ماریا شەیتانەکانیەتی. مارتینا دیەویست بزانێ ژمارەی شەیتانەکان چەندنو چۆنو چۆن دەکرێ قسانیان لەگەل بکا. کچۆلە شەش دانەی بۆ ژماردو مارتینا شەیتانێکی ئەفریقایی ناسیەوە کە جارێکی هێرشی کردۆتە سەر مالی باوکی. هێوایەکی نوێ خۆشحالی کرد.

ئەو گوتی:" زۆرم پێ خۆش بوو قسەی لەگەل بکەم."

سییەرڤا ماریا خۆشحال بوو لەو زەبرەی کە لێی دابوو. ئەو گوتی:" شەیتان ناتوانێ قسان بکا. سەیری دەم‌وچاوی دەکەی‌و تێدەگەی کەچ دەلێ." زۆر بە جیددی بەلێنی دا ئاگاداری بکاتەوە تاکوو بتوانێ لە چاوپێکەوتنی دواتردا لەگەل شەیاتین بەرەوڕوو بێ.

کایەتانۆ بە خاکەراییەوە کاروباری ناخۆشی ئەخۆشخانەی بە لێهاتووییەوە ئەنجام دا. گولەکان کە بە پێی قانوون حیسابی مردووانیان بۆ دەکرا، لە حەوشێکی تایبەتیدا کە عەرزەکەی بە چرپی‌و چالی شێلدراوی دارخورمایە داپۆشرابوو، دەخەوتن. زۆریان تەنیا دەیان توانی خۆ بۆ پێشەو راکێشن. سێشەممانە رۆژی چارەسەری گشتی رۆژێک بوو کار زۆر بوو. کایەتانۆ کە ببووە قوربانی تاکوو گوناهەکانی بشواتەوە، ئەم زەحمەتەی تەحەممول کردو داماوترین ئەخۆشەکانی لە نێو تەشتی تەویلەیدا دەشووردن. لەیەکەم شەممەی دانەوەی کەفارەتدا کە پلەی قەشەیی ئەو تا ئاستی رۆپۆشی سادەی پەرستاری نزم ببۆوە، ئابرێ نۆنچیکۆ بە سواری ئەو ئەسپەی مارکیز بە دیاریی دابوویە، گەیشتێ.

ئەو پرسی:" چاوت چۆنە؟"

کایەتانۆ دەرفەتی پێ نەدا لەبارەی چارەڕەشییەکەیدا بدوێ یان لە وەزعی بەداخ بێ. سەبارەت بەو گیراوەیەی کە بەراستی گومانی ﴿ کاریگەریی ﴾ رۆژگیرانی لە قەرنیەی چاوی سڕیبۆوە، سوپاسی کرد.

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" ئەتۆ ئەسلەن نابێ سوپاسم بکەی. ئەوەی کە باشترین هەتوان بۆ چاوتێبڕین لە خۆرەتاوەو ئەمن دەی ناسم، دام بەتۆ: " دلۆپەکانی باران."

پزیشک بۆ مالێی بانگهێشتن کرد. کایەتانۆ وەلامی دایەوە کە بەبێ ئیزن ناتوانم بە شەقام دا بڕۆم. ئابرێ نۆنچیکۆ بایەخێکی بەم قسانە نەدا. ئەو گوتی:" ئەگەر بە خالە لاوازەکانی ئەم

ولاَته بزانى، دەزانى کە قانوون تەنیا سێ ڕۆژ دەوامـى هەیـە. ئـەو کتێبخانـەی خـۆی لەبـەر دەستی کایەتانۆ نا تاکوو درێژە بە خوێندنەوەی خۆی بداو لەگـەڵ دادپـەروەری بـەرەوڕوو بـێ. کایەتانۆ بەبێ خۆفریودان بە تۆگرییەو گوێی بۆ ڕاگرت.

ئابرێ تۆنچیکۆ گوتی:" ئەمن لەگـەڵ گیروگرفتـەکانت ئـەتۆ بـە تـەنیا بـەجێ دێڵـم." و مامزەی لە قەبرغەی ئەسپەکەی کوتاو درێژەی دا:" هیچ خوایەك ناتوانێ مرۆڤێکی لێهاتووی وەك تۆ بخولێنێ‌و لە کاتی شووشتنی نەخۆشاندا بزر بێ."

سێ شەممەی دواتر ئابرێ تۆنچیکۆ " نامە فەلسەفییەکان"ی بە زمانی لاتینیی بۆ بە دیاری هێنا.کایەتانۆ هەڵی دایەوە، نێو کتێبەکەی بۆن کردو نرخەکەی قەبلاند. ئەو هەرچی زیاتر لـە ئابرێ تۆنچیکۆ ورد دەبۆوە بە ڕادەیەش شتی کەمتری دەست دەکەوت.

ئەو گوتی: " زۆرم پێ خۆشە بزانم بۆ چی ئەوەندە بۆ من میهرەبانی."

ئابرێ تۆنچیکۆ گوتی:" چونکە ئێمە مرۆڤەخواناسەکان بـەبێ قەشـەکان نـاتوانین بـژین." نەخۆشەکان لەشی خۆیان دەخەنە بەردەستمان نەك رووحیان، وەزعی ئێمـە وەك ئـی شـەیتانی دەچێ کە دەویەوێ لە نێوانی تۆو خوا دا کێشە هەڵایسێنێ."

کایەتانۆ وەڵامی دایەوە: ئەم قسەیە لەگەڵ نیەتی باشی تۆدا نایەتەوە."

ئابرێ تۆنچیکۆ گوتی:" بۆخۆشم نازانم چ قەدو گیپاڵێکیان هەیە."

کایەتانۆ گوتی:" ئیدارەی پیرۆزی کلێسا دەزانێ."

ئابرێ تۆنچیکۆ بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کەیفی ساز بوو. ئەو گوتی:" وەرە ماڵە من تاکوو تەواو بە شێنەیی لەم بارەیەوە قسە بکەین. ئەمن شەوانە ئەوپەڕەکـەی دوو سـەعەتان، ئەویش پچڕپچڕ دەخەوم، کەوابوو هەموو وەختێك دەکرێ."

مامزەی دەئەسپ کوتاو لەوێ دوور کەوتەوە.

کایـەتانۆ زۆر زوو فێـر بـوو کـە دەسـەڵاتی گـەورە قـەت نیـوەی لەدەسـت ناچـێ. هـەر ئەوکەسانەی کە پێشتر بۆ لایەنگری لەو دەنگیان بەرز کردبـۆوە، ئێـستا هـەر دەڵێـی گولێـك دەبینن‌و لێی دوور دەکەونەوە. ئەو هاوڕێیانەی کە لە هونەرو ئەدەبیاتی جیهانیدا پێڕەوییان لە بۆچوونەکانی وی دەکرد، خۆیان دوور ڕادەگرن تاکوو نەوەك لەگەڵ کلێسا تووشـی کێـشە بـن. هەر گوێشی لێ نەبوو. دڵی وی بۆ سییەرڤا ماریای لیدەدا، بەڵام بـەو بارودۆخـە ڕازی نـەبوو. ئەو پێی وابوو هیچ قانوونێکی زەریاکان یان زنجیرە کوێوەکان، دینـایی یـان ئاسمـانی، و هـیچ دەسەڵاتێکی جەهەننەمی ناتوانێ ئەم دووانە لێك بکاتەوە.

شەوێکی، بە خۆشحالّییەکی زۆرەوە لە نەخۆشخانە رای کرد، تاکوو وەك هەموو جارێ بە نهێنی بچێتە پەرستگە. ئەوێ چوار دەگای چوونە ژوورەوەی هەبوو. دەرگای سەرەکی بە کولانەیەکی هەوا کێشەوە ، دەرگایەکی دیکەی وەك ئەو کە بەلای دەریادا دەکرایەوە، دوو دەرگای بچووکی دیکەی پێراگەیشتن. دوو دەرگا سەرەکیەکە چیان لەگەلّ نەدەکرا. کایەتانۆ پێویستیی بەوە نەبوو لە قەراغ دەریاوە پەنجەرەی سییەرڤا ماریای دەستنیشان بکا، چونکە تاقە رێگایەك لە هەردوو لا بوو کە پەرژینی داری نەبوو. ئەو خانووەکەی لە لای شەقامێ‌را بست بە بست هەلّسەنگاند، لەخۆڕا بە دوای کەرەسەیەکدا دەگەڕا کە بتوانێ خۆی پێ هەلّکێشێتە سەرێ.

کایەتانۆ دوو دلّ بوو لەوەی کە دەست لە هەولّەکانی خۆی هەلّبگرێ، کەوتەوە بیری تۆنێلێك کە خەلّك لە کاتی هەلّگەڕانەوە لە بڕیارەکانی خوادا خواردنی پێویستی پەرستگەیان لە وێوە دابین دەکرد. ئەو تۆنێلانەی کە دەچوونەوە سەر پەرستگە یان سەربازخانەکان تایبەتمەندیی هەموو قۆناغەکان بوو. خەلّکی ئەو سەردەمانە لە شارەکان لانی کەم شەش تۆنێلیان پێ شك دەهات و بە تێپەڕینی کات ژمارەیەکی دیکەشیان دۆزینەوە کە بۆ کاتی تەنگانە لەبار بوون. لەنێو گولەکاندا گۆڕهەلّکەنێکی پێشوو تۆنێلی مەبەستی بۆ کایەتانۆ ئاشکرا کرد: گۆڕستانێکی کۆنو بێ کەلك پەرستگەی دەگەیاندەوە سەر پارچە زەوییەکی تەنیشتی کە سەد سالّ لەوەپێش یەکەم گۆڕستانی کلارسییەنەکان بوو. ئەم تۆنێلە راست لە پێش دیوارێکی بەرز و ئەستوور بوو کە کەس نەی دەتوانی وەسەری کەوێ، لە ژێر بینای زیندان سەری وەدەر دەنا. کایەتانۆ پاش هەولّێکی زۆرو بێ سوود، هەروەك بیری دەکردەوە بە هێزی ئیمان بە هەموو شتێك دەگەیو سەردەکەوی.

بینای زیندان لە جەنگەی بەیانیدا دوڕگەی ئارام بوو، بە دلّنیاییەکی تەواوەوە لەوەکە ژنانی کێشکچی لە جێگایەکی دیکەوە دەخەون. تەنیا خۆی لە مارتینا دەپاراست کە دەرگای ژوورەکەی نیوە کراوە بوو پرخەی دەهات. تا ئەم کاتە دلّەراوکێو بێ ئۆقرەیی پشوویان پێ سوار کردبوو. کاتێك دیسان ژووری سییەرڤا ماریای بە قفلّی زامیندار لە نێو زنجیردا دیت، دلّی داخورپا. بە سەری قامکانی فشاری بۆ دەرگا هێنا. هەر کە جیرەجیری لاولاوەی دەرگا بەرزبۆوە، هەناسەی سوار بوو. سییەرڤا ماریای چاو پێ کەوت کە لە تەمێکی نووری هەمیشەییدا خەوتوە. لەپڕ چاوەکانی کردنەوەو تاوێکی پێچوو تاکوو توانی دیلاڤرای بە کراسی بەنی گولەکان بناسێتەوە. کایەتانۆ نینۆکە خوێناوییەکانی خۆی پێ نیشان دا.

بە سرتە پێی گوت:" ئەمن لە دیواری وەسەر کەوتووم."
سییەرڤا ماریا گوتی:" بۆ چی؟"
ئەو گوتی:" بۆ ئەوەی تۆ ببینم."
ئیدی نەیدەزانی دەبێ چی دیکە بڵێ، لە لەرزینی دەستو دەنگی تووڕەی خۆی پەرێشان ببوو.
سییەرڤا ماریا گوتی:" برۆ!"
چونکە لەوانە بوو دەنگی ئاشکرای بکا، لە حاڵێك لە ترسان دەلەرزی، چەندین جار سەری جولاند، کچۆڵە دیسان دووپاتی کردەوە: " برۆ دەنا هاوار دەکەم." کایەتانۆ ئێستا ئەوەندە لەوی نزیك بوو کە ئەیدەتوانی هەست بە هەناسەی کچانەی وی بکا.
" تەنانەت ئەگەر بە قەسدی کوشتنێم لێ بدەن ناڕۆم." و لەپڕ خۆی بە گەورەتر لە ترس هەست پێ کردو بە دەنگێکی بوێرانەوە گوتی:" ئەگەر دەتەوێ هاوار بکەی، هەر ئێستا دەتوانی دەست پێبکەی."
کچۆڵە لێوی خۆی گەست. کایەتانۆ لەسەر نوێنان دانیشتو رووداوی سزایەکەی بە وردی بۆ گێڕایەوە بەڵام هۆیەکەی پێ نەگوت. کاتێك توانی وەقسە بێ، کچۆڵە زیاتر لە بابەتەکە گەیشت. سییەرڤا ماریا بەبێ هیچ چەشنە گومانێك سەیری کردو پرسی بۆچی چیدیکە چاوبەند لە چاوی نادا.
ئەو بە شادمانیەوە وەڵامی دایەوە:" ئیدی پێویستم پێی نیە، ئێستا ئەگەر چاوم ببەستم رووباری زێڕینی ئاڵقەی بسکت نابینم."
پاش دوو سەعات بە هەستێکی بەختەوەرانە لەوێ رۆیشت، چونکە سییەرڤا ماریا ئیزنی پێ دا دیسان بێتەوە بە مەرجێك بە دەرگای سەرەکیدا لەو شیرینیانەی بۆ بێنێ کە پێی خۆشن. ئێوارەی رۆژی دواتر ئەوەندە زوو هات کە هێشتا پەرستگە هەر ئاوەدان بوو، بەڵام لە ژووری سییەرڤا ماریادا هێشتا چرا دایسا تاکوو میلدۆزیی مارتینای تەواو بکا. شەوی سێیەم رۆنو پلیتەی هێنا تاکوو چرایەکەی پڕ بکاتەوە. لە شەوی چوارەمی رۆژی شەممەدا چەندین سەعات لەسەریەك یارمەتیی سییەرڤا ماریای دا بۆ ئەوەی لە ئەسپێیان خۆی بدۆزێ، چونکە ئەم گیانلەبەرە لە زینداندا خێرا زیاد دەکا. کاتێك شەپۆلی پرچی خاوێن بۆوەو شەی لیدرا، کایەتانۆ جارێکی دیکە هەستی بە ئارەقی ساردی وەسوەسە لە لەشیدا کرد. ئەو لە کاتێکدا هەناسەی لە سینگیدا راگرتبوو لە پەنا سییەرڤا ماریای راکشاو لەگەڵ چاوەگەشەکانی

رووبەڕوو بۆوە، کە بستێکی لێ دوور بوو. هەردووکیان شڵەژابوون. کایەتانۆ لە ترسان دوعای دەکردو لە بەرامبەر روانینی سییەرڤادا خۆی ڕاگرت.

سییەرڤا غیرەتی قسانی وەبەر هات:" ئەتۆ تەمەنەت چەندە؟"

ئەو گوتی:" لە مانگی مارس بوومە سیو شەش ساڵە."

کچۆڵە بە وردی سەیری کرد.

زەردەیەکی هاتێو گوتی:" ئەتۆ پیاوێکی بەتەمەنی." ئەو سەیری گنجەکانی نێوچاوانی کایەتانۆی کردو بە دڵڕقیی خۆی لە بارەی تەمەنەوەی زیاد کرد:" پیاویلکەیەکی دەموچاو گنجاوی." کایەتانۆ بە رووخۆشییەوە قسەکانی بە دڵو بەگیان وەردەگرت. سییەرڤا ماریا پرسی، بۆچی پەڵەیەکی سپیی لەسەر سەری هەیە.

ئەو گوتی:" زکماك وام."

کچۆڵە گوتی:" کاڵ بۆتەوە."

کایەتانۆ گوتی:" زگماك وام. دایکیشم هەر وا بوو." ئەو هەروا دەیڕوانیە چاوەکانی سییەرڤا ماریاو سییەرڤا بە پێویستی نەدەزانی رووی خۆی وەرگێڕێ. کایەتانۆ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو لە بەر گوتی:

" هۆ خولقێنەری سێوی شیرینی کەفارەتی چارەڕەشیی من."

سییەرڤا لێی تێ نەگەیی.

ئەو باسی کرد:" ئەوە شێعرێکی بابەگەورەی باوکی دایەگەورەی منە. ئەو سێ قەسیدەی گوندی، دوو هەجوونامە، پێنج لیریكو چل سۆناتی نووسیبوو. زۆربەیانی بۆ ژنێکی پورتوگالی نووسی کە گێلۆکە بوو و قەتیش پێی نەگەیشت، چونکە خێزاندار بوو دواتر ژنێکی دیکەی هێناو بەر لەوی مرد."

" ئەو هاو ئایینی بوو."

وەڵامی دایەوە:" سەرباز بوو."

شتێك دڵی سییەرڤا ماریای وورووژاند، چونکە دەیەویست جارێکی دیکەش گوێی لەم شێعرە بێتەوە. کایەتانۆ ئەمجار بە دەنگێکی پڕ لە زایەڵەو باشو ساف شێعرەکەی دووپاتە کردەوە تا گەیشتە دواییو چلەمین سۆناتی سوارەی چەكو ئەوینی دۆن گارسیلاسۆ دیلاڤگا کە لە لووتکەی ساڵانی گەشەکردن لە کاتی شەڕدا بەردێکی وێکەوت.

کاتێك تا کۆتایی خوێندییەوە، دەستی سییەرڤا ماریای گرتو لەسەر دڵی خۆی دانا، سییەرڤا ماریا هەستی بە گاڵەی تۆفانێی کرد.

کایەتانۆ گوتی:" ئەمن هەمیشە لەم حاڵە دام."

بێ ئەوەی دەرفەت بە وەزعی پەرێشانی بدا، خۆی لە هەموو ئەو شتانەی دڵیان دەڕەنجاندو ئیزنی ژیانیان پێ نەدەدا، دەرباز کرد. بۆ سییەرڤا ماریای درکاند، ساتێك نەبووە کە لە فکریدا نەبێو هەرچی خورادوویەتیو خواردوویەتەوە تامی ئەوی داوە، چونکە لە هەرکاتو شوێنێکدا ژیان بریتییە لە سییەرڤا ماریاو جگە لەمە تەنیا خوا ئەو مافو دەسەڵاتەی هەبووە، ئەمە لووتکەی ویستی دڵی ئەوە کە لەگەڵ سییەرڤا ماریای بمرێ. درێژەی بە قسەکانی دا، بێ ئەوەی ببینێ، بەوجۆرەی کە زوڵاڵو خۆشە لەبەر خوێندییەوە، سییەرڤا ماریا خەوی لێکەوتبوو. کەمێکی غیرەت وەبەر هاتو پرسی:"

" ئێستا چی؟"

کایەتانۆ گوتی:" ئێستا هیچ، بۆمن ئەوەندە بەسە کە ئەتۆ دەزانی."

ئەو ئیدی نەیدەتوانی قسان بکا، بە ئارامی گریاو لە جیاتی سەرین باسکی وەبن سەری سییەرڤا ماریا دا، و سییەرڤا پاڵی وێدا. هەروا مانەوەو خەویان لێ نەکەوت. قسەیەکیان نەکرد، تاکوو بانگی کەڵەشێر بەرز بۆوەو ئەو دەبووا پەلەی بکا تاکوو سەری سەعات پێنج بگاتە نوێژی بەیانی. بەر لە رۆیشتن، سییەرڤا ماریا ملوانکەی بە شکۆی ئۆددوڤۆتای پێشکێش کرد: هەژدە توسیل درێژایی، لە جۆری سەدەفو سەدەفی مەرجانی بوو.

ناهومێدی لە دڵی بەش مەینەتی کۆچی کردبوو. دیلاڤرای بێ ئۆقرە هەموو کارێکی دەکرد، ئیزنی دا لێی خورن. دەرفەتێکی وا هەڵکەوت کە لە نەخۆشخانە رای کرد تاکوو سییەرڤا ماریای ببینێ، لە حاڵێکدا لە ژێر بارانەی درێژماوەدا تەڕببوو بە هەناسە برکێ وەژوور کەوت، و سییەرڤا ماریا ئەوەندە بە ئیحتیاجەوە چاوەڕوانی بوو کە یەکەم پێکەنینی، سییەرڤا ماریای بووژاندەوە. سییەرڤا یەکێك لە شەوەکانی بە شێعرێك کە چەندین جاری گوێ لێ بووەو لەبەری کردوە، دەست پێکرد:

" ئەمن ئارام راوەستاوم. سەیری وەزعی خۆمو هەنگاوەکانم بکەم کە تۆ پێشانم دەدەی." و بوێرانە پرسی:" ئەرێ پاشماوەی ئەم شێعرە چۆنە؟"

ئەو گوتی:" دەبینم چۆن خۆمم بە دڵپاکی فیدا کردوەو، ئەویش ماڵوێرانی کردمو بەدەست مەرگم دەسپێرێ." سییەرڤا ماریا هەر بەو جوانییە شێعرەکەی دووپاتە کردەوە و ئەوان تا

کۆتایی هەر بەم جۆرە درێژەیان پێ دا، دێڕیان دەبواردن و سۆناتەکانیان دەگۆڕی و بەراوەژوویان دەکردنەوە، بەو جۆرەی کە پێیان خۆش بوو، بە گوێرەی وەوزعی خۆیان گەمەیان لەگەڵ دەکردن و بەسەریاندا زاڵ دەبوون هەروا بزانە شێعرەکان نی ئەو دووانەن. لە ماندوویەتی خەویان لێکەوت. بە زایەڵەی بانگی کەڵەشێرەکان ژنە ئێشکگر بە قاوەڵتەییەوە گەیشتێ و هەردووکیان بە نیگەرانییەوە لە خەو رابوون. بێدەنگی بەسەر دەوروبەریاندا زاڵ بوو. ژنە ئێشکگر قاوەڵتییەکەی لەسەر میز دانا. بە سووکە ئاورێك چرایەکەی هەڵسەنگاند، بێ ئەوەی کایەتانۆی لە نێو پێخەفیدا ببینێ وەدەر کەوت.

کایەتانۆ کاتێك دیسان پشووی هاتەوە بەر، گوتی:" شەیتان قالۆچەیەکی گەندوگوو خۆرە. ئەو تەنانەت منیشی وا لێکرد نەبینرێم."

سییەرڤا ماریا دەبووا فێڵێکی دیکەی دەکار کردبا تاکوو ئەو رۆژە ژنە ئێشکگر جارێکی دیکە نەیەتەوە ژوورێ. لە نێوەڕاستەکانی شەوێدا پاش رۆژێك خۆشیی زۆر، وەك هەمیشە هەستیان بەوە دەکرد یەکتریان خۆش دەوێ. کایەتانۆ دەیەویست کارێکی مەترسیدار بکا، لە سنووری نێوان گاڵتەو راستیدا بەندی جلوبەرگانی بکاتەوە. سییەرڤا ماریا بە هەردووك دەستان پارێزگاریی لە مەمکەکانی کرد. تووڕەیی لە چاوەکانیدا بریسکەیان داو شەپۆلێکی سوور نێوچاوانی داگیرساند. دەتگوت ئاگرە بڵێسەی دێ. کایەتانۆ بە قامکی گەورەی و قامکی ئیشارەی دەستەکانی ئەوی گرت و لەسەر سینگیی لابرد. سییەرڤا ماریا هەوڵی دەدا بەربەرەکانێ بکا. بەڵام ئەو بە هێزێکی لێزانانەو لێبڕاوانەوە زاڵ بوو.

کایەتانۆ گوتی:" لەگەڵم بڵێوە: سەرەنجام دێمە باوەشت."

سییەرڤا قبووڵی کرد. کایەتانۆ درێژەی دا:" لەهەرجێیەك بەوێ بمرم."و وێڕای ئەمە بە قامکە ساردەکانی جلوبەرگەکەی کردەوە. سییەڤا ماریا کە لە ترسان دەلەرزی، بە نووزەنووز دووپاتی کردەوە:"تەنیا لەگەڵ من دەکرا بێسەلمێنی کە شمشێری سەرکەوتووان چەندە بە قووڵی دەبڕێ." پاشان بۆ یەکەم جار لێوی ماچ کرد. لەشی سییەرڤا ماریای بە ئیعتیرازەوە دەلەرزی، ئەو لە جوانیی شنەی دەریا هەناسەی هەڵکێشا و خۆی بە دەستی چارەنووس ئەسپارد. کایەتانۆ سەری قامکانی بەسەر لەشی سییەرڤا ماریا دا دێنا. هێشتا دەستی لێ نەدابوو کە بۆ یەکەجار موعجیزەیەك رووی داو خۆی لە قالبێکی دیکەدا هەست پێکرد. هاوارێکی دەروونی بانگی کرد، کە چەندە لە بێخەوییەکانی لاتینی و یۆنانی دوور کەوتۆتەوە. لە شەوق و زەوقی ئیمانی، لە بیابانی پاکیدا ببووە شەیتان. لە حالێکدا سییەرڤا ماریا لە

کۆختی کۆیلەکاندا بە هەموو تواناوە، ئەوینی ئازاد فێر ببوو، خۆی دا بە دەستی سییەرڤا تاکوو لە تاریکیدا بە دەستەکوتە بچێتە پێش بەڵام لە لەحزەی کۆتاییدا پەژیوان بۆوەو چووە نێو قووڵایی عەزابی ویژدانەوە. ئەو بە چاوی لەسەریەك دانراوەوە لەسەر پشتێ راکشا. سییەرڤا لە بێدەنگیی وەك مردووانی ئەو ترساو بە قامکی لێی داو گوتی:

" چ قەوماوە؟" بە سرتە گوتی:" لێم گەڕێ، دوعایە دەکەم."

تەنیا لەو رۆژانەدا کە پێکەوە بوون بۆ ماوەیەکی کورت ئاسوودە بوون. ماندوو دەبوونو باسی ژانو ئەوینیان دەکرد. کاتی خۆیان بە سرتو خورت تێپەڕ دەکردو فرمێسکیان هەڵدەوەراندو خەریکی خوێندنەوەی شێعری دڵداری دەبوون. گۆرانییان لە بن گوێی یەکتردا دەگوت. تا ئەوپەڕی توانایان لە زۆنگاوی حەزەکانیاندا دەگەوزین: ماندوو بەڵام کچۆڵانە. ئەو بڕیاریدا لەسەر پەیمانو بەڵێن سوور بێ، تاکوو سوێندی وەفادارییان خواردو سییەرڤا ماریا لەگەڵی یەکی گرت.

لە حەسانەوە پڕلە دڵە خورپەکاندا ئەوینی بێسنووری خۆیان بۆ یەکتری سەلماند. بە سییەرڤا ماریای گوت، سەبارەت بەوی ئامادەیە مل بۆ هەموو کارێك رابکێشێ. سییەرڤا ماریا بە دڵڕەقییەکی منداڵانەوە دەیەویست سەبارەت بەوی قالۆچەی بخوا. کایەتانۆ قالۆچەیەکی گرتو بەر لەوەی سییەرڤا ماریا بتوانێ خۆی بگەیەنێتێ، بە زیندوویی قووتی دا. یەکێکی دیکە لە پالنەرە گێلانەکان ئەوە بوو کە لە سییەرڤا ماریای پرسی ئایا لەبەر خاتری وی دەتوانێ پرچی خۆی ببڕێ. ئەو وەڵامی ئەرێی دایەوە، جا بە گاڵتە یان بە راستی پێداگریی کرد کە ئەوکات دەبێ مێردم پێ بکەی بۆ ئەوەی بەڵێنت بەجێ هێنابێ. ئەو چەقۆی مەتبەخی هێنایە ژووریو گوتی:" ئێستا با بزانم لەسەر بەڵێنی خۆت سووری یان نا." کچۆڵە پشتی تێ کرد تاکوو پرچی لە بنیڕا ببڕێ. بە پێداگرییەوە گوتی:" (( تەنیا غیرەتت هەبێ)). بەڵام کایەتانۆ غیرەتی نەبوو. رۆژی دواتر لێی پرسی ئایا ئامادە خۆی وەك نێرییەك بۆ بکوژێتەوە . ئەو بە لێبڕاوییەوە وەڵامی ئەرێی دایەوە. کچۆڵەکە کێردی هەڵگرتو دەیەویست وەك نموونە تاقیی بکاتەوە. لەرزینێکی کوشندە بەسەر لەشی کایەتانۆدا زاڵ بوو و بە ترسەوە لە جێی خۆی راست بۆوەو گوتی:

" ئەتۆ نا، ئەتۆ نا." سییەرڤا ماریا ئەوەندە پێکەنی ژانەزگی گرت، دەویست بزانێ بۆ. کایەتانۆ راستییەکەی پێ گوت:

" ئەتۆ دەوێری ئەوەی بکەی."

لە کاتە ئارامەکانی هاودەردیدا بڕیاریان دا لە رۆژانی بێکاریی ئەوینی رۆژانەیان چێژ وەربگرن. سییەرڤا ماریا ژووری بۆ کایەتانۆ خاوێنو رێکوپێك دەکردەوەو ئەویش وەك مێردی

راستی دەهاتەوە ماڵێ. کایەتانۆ لە چاوەڕوانیی ڕۆژانی بەختەوەریدا، ئەو ڕۆژانەی کە دەبــووا پێکەوە دەزگیرانو ئازاد بووایەن، خوێندنو نووسینی فێرکــردو لەگـەڵ جیهـانی شـێعرو نـزای خواوەندا ئاشنای کرد.

٢٧ی ئەپریل کە بەیان ئەنگوت، پاش ئەوەی کایەتانۆ ژووری بەجێ هێشت، سییەرڤا ماریا هێشتا خەوی لێنەکەوتبوو کە لە پڕ گەیشتنێ تاکوو دوعای دەرکردنی شەیتانێ بخوێنن. ئەمە ڕێوڕەسمی مەحکوومێك بە مەرگ بوو. ئەویان بــە ڕاکێـشان بــۆ لای ئـاخوڕی وڵاغـان بــردو سەتڵێکیان ئاو بەسەریدا کرد، ملوانکەکانیان لەبەر دارنیو جلوبەرگی زووری مورتــەدەکانیان لەبەر کرد. ڕاهیبەیەك لە بەشی باغەوانی بە مقەستێکی باغــەوانی پرچــی هــەتا پاشەســتۆیە چوار قۆزاخە کورت کردەوەو هەڵی داشــتە ســەر تێلەکەیــەك چــرپیو چــاڵ کــە لــە حەوشــەی دەسووتان. خوشکی دەللاك بن پرچیی بــە قــەد نیــو توسـیل ڕاســت بــە قــەد درێــژیی پرچــی کلاریسییەنەکان لە بن لێچکە هەڵپاچی. دوای ئەوەی پرچی بڕی، ئازا هاویشتنیە سەر بڵێسەی ئاگر. سییەرڤا ماریا سەیری ئاگری زێڕینی کرد. دەنگی قرچەقرچــی دارێکــی تــازەی بیــست، بۆگەنیوی ناخۆشی لقێکی سووتاوی بۆ هات، بــێ ئــەوەی ماســوولکەیەك لــە ڕوخــساری وەك بەردی بجووڵێ، لە کۆتاییدا جاکەتێکیان بە زۆرە ملی لەبەر کرد. لەشیان بــە قوماشــی تازیــە داپۆشیو دوو کۆیلە ئەویان لەسەر ئەقالەیەکی سەحرایی بردە پەرستگە.

ئۆسقۆف ئەنجومەنی کلێسای بانگ کرد کە لە مەعاشــخۆرە ناســراوەکان پێــك هــاتبوو. ئــەوان چوار کەسیان لە نێو خۆیان هەڵبژارد تاکوو لە ڕێوڕەسمی جنلووکەگرتندا یارمەتیی ئۆسقۆف بــدەن. لە یەکێك لە دوایین بەڵگە سەلماوەکاندا ئۆسقۆف گوێی بە وەزعی خراپی سلامەتیی خۆی نەدا. ئــەو فەرمانی کرد تا ڕێوڕەسمەکەی وەك هەموو دەرفەتە گونجاوەکان نەك لە کلێسای گشتی بــەڵکوو لــە پەرستگەی سانتاکلارا بەڕێوە بەرنو بۆخۆی بەڕێوەچوونی جندووکە گرتنی بە ئەستۆوە گرت.

بەڕێوەبەری پەرستگە کلاریسییەنەکانی ڕێنوێنی دەکرد، ئەوان بــەر لــە عیبــادەتی بــەیانی بــۆ سروودی بە کۆمەڵ هاتبوون و دەستیان بە ئاوازی نزا کرد، ئۆرگێك بۆی لیدەدانو هــەواڵی جوولــەی خۆشی ڕۆژێکی نوێی پێ دەدان. پاشان خاوەن پلــەکانی ئەنجومــەنی مەعاشــخۆران، سەرپەرســتانی کاروباری دەرەوە، سێ قەشەی خاوەن پلەو بەڕێوەبەرانی ئیدارەی کلێسای پیرۆز وەژوور کەوتن. جگە لەو کەسانەی دوایی، کەسانی مەدەنی، نە لەوێ بوونو نە ئیزنی هاتنە ژووریان هەبوو.

دوای هەمووان ئۆسقۆف لە بەرگی تەواو فەرمیدا گەیشتێ، کۆیلەکان ئــەویان بــە کــەژاوە دەگێڕاو تەمێك لە غەمێکی سارێژنەبۆوە دەوری تەنیبوو. لە بەرامبەر مێخرابی سەرەکیدا، لە

پەنا تابووتێکی مەرمەڕ بۆ بەخاک ئەسپاردنە بەشکۆیەکان لەسەر کورسیەکی جوولە دانیشت و ئەوی بە جموجۆڵتر نیشان دەدا.

سەری سەعات شەش دوو کۆیلە سییەرڤا ماریایان لەسەر نەقالەی سەحرایی هێنا. ئەو جاکەتی زۆرەملیی لەبەر دابوو و لەشی هەروا بە قوماشێکی بنەوشیی تۆخ داپۆشرابوو.

لە کاتی گوتنی ئاوازەکانی نزادا، گەرمای هەوا تاقەت پڕووکێن بوو. دەنگی بۆڵی ئۆرگ لە میچی داریەوە دەهات و مەودایەکی کەم بۆ سروودی کلاریسییەنەکان مابۆوە کە لە پشت حەوشی داریی گرووپی هاوئاوازەکانەوە نەدەکرا ببینرێن. لە کۆتایی نزادا قوماشەکەیان لەسەر لادا و وەك شازادەیەکی مردوو لەسەر تابووتی مەرمەڕییان دانا. کۆیلەکان ئۆسقۆفیان لەسەر کورسی بردە پێش سییەرڤا ماریا و هەردووکیان لە دووری مێحرابی سەرەکی بە تەنیا بەجێ هێشت.

لەوکاتەدا کە دڵەخورپەیەکی تاقەتپڕووکێن هەستی پێ دەکرا بێدەنگییەکی تەواو زاڵ بوو، کە وەك شانۆیەك لە موعجیزەیەکی ئاسمانی خۆی دەنواند. یەکێك لە خزمەتکارانی نزا دەفرێکی ئاوی خاوێنی لە ئۆسقۆف نزیك کردەوە. ئۆسقۆف ئەوی وەك باتووم راوەشاندو بۆلای سییەرسڤا ماریا کووڕ بۆوەو لە حاڵێکدا کە دوعایەکی لەبن لێوییەوە دەگوتەوە لەسەرەوە تا خوارێ بە لەشی کچۆڵەی دا پرژاند. لەپڕ دوعای دەرکردنی شەیتانی دەست پێ کرد کە بووە هۆی لەرزینی کۆڵەکەکانی پەرستگە.

ئۆسقۆف هاواری کرد:" بە فەرمانی مەسیحی پیرۆز، سەروەرو خوای بینراو نەبینراوەکان بووەو هەیەو دەشبێ، هەرکەسێك هەی، بەو غوسلە تەعمیدە رزگاریدەرە لە لەشی ئەو وەرە دەرەوەو بچۆوەنێو تاریکاییەکانەوە."

سییەرڤا ماریا کە دڵی لەخۆ ببۆوە، لە شیددەتی ترس قیژاندی. ئۆسقۆف دەنگی خۆی بەرزتر کرد تاکوو بەسەر قیژەی کچۆڵەدا زاڵ بێ، بەڵام کچۆڵە دەنگی بەرزتر بۆوە. ئۆسقۆف هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو زاری کردەوە تاکوو درێژە بە دوعای جندووکە گرتن بدا، بەڵام هەناسەی لیبڕاو نەیدەتوانی هەناسەی بداتەوە دەر. لە پڕ کەوتە سەر عەرزی‌و وەك ماسی لەسەر زەوی هەوای دەخوازی‌و ڕێورەسمەکە بە دەنگ‌و هەرایەکی زۆرەوە کۆتایی پێ‌هات.

کایەتانۆ هەر ئەو شەوە ماریای لە جاکەتی زۆرەملیدا دیتەوەکە تاوتوێی لێ بوو. زیاتر لە هەموو شتێکی بە بڕینی پرچی سییەرڤا ماریای تووڕە بوو. لە کاتی کردنەوەی بەندەکانی کچۆڵەدا بە تووڕەییەکی دەروونییەوە دەی بۆڵاند:" خوای ئاسمانەکان، چۆن دەکرێ تاوانێکی وا قبووڵ بکەی." کاتێك کچۆڵە کرایەوە، سەری خۆی لەسەر سینگی کایەتانۆ داناو تا ئەوکاتەی دەگریا هەردووکیان بە

بێدەنگی یەکتریان لە باوەش گرتبوو. کایەتانۆ لیگەڕا تاکوو سییەرڤا ماریا بگرێ. پاشان روخساری هەڵێناو گوتی:" گریان بەسە." و بە شێعرێکی گارسیلاسۆ درێژەی دا:

" زۆرم لە دەستیان چاشت، تاکوو لەبەر خاتری تۆ هەنگاو بنێم."

سییەرڤا ماریا باسی ئەو شتە ترسناکانەی کردبوو کە لە پەرستگە دەیتبوونی. باسی نرکەی دەنگی کۆڕ کە وەك سروودی شەڕ دەچوون، باسی هاوارەکانی ئۆسقۆف کە وەك هاواری ترسناکی خەون دەچوون، هەناسەی سووتێنەری ئەو، باسی چاوە شینە جوانەکانی دەکرد کە بە هۆی تەوژمی جەزم بڵێسەیان دەدا.

سییەرڤا ماریا گوتی:" ئەو وەك شەتانێ بوو."

کایەتانۆ هەوڵی دا هێوری بکاتەوە. سییەرڤا ماریای دڵنیا کردەوە کە ئۆسقۆف سەرەڕای چاوی دەروونی، دەنگی تۆفانیو ئاکاری شەڕانی، برۆڤێکی باشو ماقوولە. ترسی وی بە جێیەو مەترسییەك لەلایەن سییەرڤاوە نیە.

سییەرڤا ماریا گوتی." ئەمن تەنیا دەمەوێ بمرم."

کایەتانۆ گوتی:" ئەتۆ تووڕەیو هەست بە سووکایەتی دەکەی. ئەمنیش هەستێکی وام هەیە، چونکە ناتوانم یارمەتیت بدەم. بەڵام خوا لە رۆژی قیامەتێ پاداشمان دەداتەوە."

کایەتانۆ ملوانکەی ئۆدیدوئایی کە سییەرڤا ماریا پێشکێشی کردبوو لە ملی خۆی کردەوەو لە جێی ملوانکەکانی دیکەی دانا. ئەوان شانبەشانی یەکتر لە پەنا یەکتر پاڵیان دایەوەو کاتێك جیهان لەنێو چووو تەنیا کێکە کرمخواردووەکان لە جەعبەکاندا بەجێ مان، ئەوان تووڕەیی خۆیان لە نێو خۆیاندا دابەش کرد. هەڵچوون دامرکایەوە. کایەتانۆ لە تاریکیدا قسەی دەکرد.

ئەو گوتی:" بۆ دەرکەوتن رۆژێکی رادەگەیەنن کە قەت دەست پێ ناکا. ئەگەر خوا بیەوێ ئەمرۆ ئەو رۆژەیە."

سییەرڤا ماریا پاش رۆیشتنی کایەتانۆ سەعاتێك دەبوو نوستبوو کە دەنگێك دیسان وەخەبەری هێنا. لەگەڵ بەڕێوەبەری پەرستگە قەشەیەکی بەتەمەنی زۆر دەست ڕۆیشتوو، بە پێستی قاوەیی رەنگو پڕلە ئارەقەوەو مووی ئاڵۆزکاو قرژو برۆی ئاڵۆزو شێواو ، دەستی زوورو جووتە چاوێکەوە کە متمانەیان لێ دەباری لە بەرامبەری راوەستابوون. بەر لەوەی سییەرڤا ماریا بە تەواوی وەخەبەر بێ، قەشە بە زمانی یورووبایی گوتی:" ئەمن ملوانکەکانم بۆ هێناویەتەوە."

لەسەر دوای قەشە، بەڕێوەبەری پەرستگە ملوانکەکانی بەوی ئەسپاردبوو، و ئەو لە گیرفانی خۆی دەرهێنان. کاتێك قەشەکە ملوانەکانی یەکبەدوای یەکدا بە ملی سییەرڤا

ماریاوە هەڵدداوەسی، دەی ئەژماردن‌و بە روونیی زمانە ئەفریقییەکان دەی گوت:" سوورو سپی، لە ئەوین‌و خوێنی شانگۆ، سوورو رەش لە ژیان‌و مەرگی خوای گۆڤا، حەوت مرواریی کریستاڵی ویە مایای شینی کەم رەنگ." ئەو زۆر بە جوانی لە زمانی یوروبابییەوە بۆ زمانی کۆنگۆیی‌و لە کۆنگۆییەوە بۆ ماندینگایی دەدوا و کچۆڵە بە رووخۆشی‌و ئارامی سەرنجی دەدایە قسەکانی. سەرەنجام کاتێك ئەو بێ گوێدان بە بوونی بەڕێوەبەری پەرستگە لەوێ، بە زمانی ئیسپانیۆلی دەستی بە قسان کرد، بەڕێوەبەر لەرادەبەدر تووشی سەرسوڕمان بوو کە سییەرڤا ماریا سەبرو حەوسەلەیەکی ئاوای هەیە.

ئەو باوکە تۆماس دی ئاکینۆ دی ئارڤائیز سکاڵاکاری پێشووی دادگای پشکنینی بیروباوەڕ لە سەڤیلاو قەشەی ناوچەی کۆیلەکان بوو کە ئۆسقۆف لەبەر بارودۆخی نالەباری سلامەتیی خۆی ئەوی دیاری کرد تاکوو لە جیاتی وی شەڕی شەیتانێ بکا. ئاکینۆ پیاوێکی تووڕە بووو ژیاننامەکەی پرسیارێکی زۆری لەسەر بوو. ئەو یازدە مورتەدو جولەکەو مسولمانی لەسەر لیژنەی دران سووتاندبوو ، بەڵام بۆ ناوبانگی باشی، بەر لە هەموو شت خۆی بە قەرزداری ژمارەیەکی زۆر جندووکەی ئەندەلۆسی دەزانی کە دەری کردبوون. مرۆڤێکی دیار، رووخۆش‌و گفتولفتێکی نەرمی وەك قەناریانی هەبوو. باوکی نوێنەری "تام الاختیار" ی پاشا، لەگەڵ کۆیلەیەکی کوارتە روون زەماوەندی کردو ئەو هەرلەوێ لەدایك بوو و پاش ئەوەی توانی سەرچاوەی پاکیی خۆی لە رێگەی چوار نەسلی سپی پێستەوە بسەلمێنێ قۆناغی تاقیکرانەوەی پەرستگەی لە قوتابخانەی تەڵەبان لە ناوچەکەیدا تێپەڕاند. نمرە باشەکانی پلەی دوکتۆرای لە سەڤیلا بۆ بە دیاری هێنا، ئەو شارەی کە پەنجا ساڵی لێ ژیاو عیبادەتی لێکردبوو. لە کاتی گەڕانەوە بۆ هەرێمی خۆی داوای کرد بیهنێرنە هەژارترین ناوچە. ئەو حەزی لە ئایین‌و زمانە ئەفریقاییەکان بووو وەك کۆیلەیەك لە پەنا کۆیلەکان دەژیا. وا نەدەهاتە بەرچاو کەسێك جگە لەوی بۆ دەستەویەخەبوون لەگەڵ سییەرڤا ماریا لەبار بێ‌و بتوانێ بە لێهاتووییەوە لەگەڵ شەیتان بەرەوڕوو بێ.

سییەرڤا ماریا خێرا ئەوی وەك مەلەکەی موقەڕیب ناسی‌و هەڵەشی نەدەکرد. لە کن سییەرڤا بەڵگەی نێو فایلەکانی دەپشکنی‌و بۆ بەڕێوەبەری پەرستگەی دەسەلماند کە هیچ کام لەمانە تەواو نین. فێری بەڕێوەبەری کرد کە شەیتانەکانی ئەمریکا وەك شەیتانەکانی ئورووپان‌و تەنیا شێوی بانگکردن‌و رەفتاریان جیاوازە. ئەو چوار بنەمای بۆ شەیتان لێدراوەکان باس کرد کە کەڵکیان لێ وەردەگیرێ‌و نیشانی دا کە سوود لێوەرگرتنیان چەندە سانایە، تاکوو پێچەوانەی ئەمە پەسند دەکرێ. لە کاتی ماڵاواییدا لە رووی موحیببەتەوە کولمی سییەرڤا ماریای هەڵقورینجی.

پێی گوت:" بە ئاسوودەییەوە بنوو، ئەمن سەروکارم لەگەڵ دوژمنانی تووڕە هەبووە."

لەوە بەدوا بەڕێوەبەری پەرستگە وەها کـاری تـێکرا کـە قەشـەی بـۆ چـوکلێتی خـۆش‌و بەناوبانگی کلاریسیەنەکان، کێکی تایبەتیی گیایی‌و باشترین شیرینیی بانگهێشتن دەکرد کە بە دڵخوازی خۆی لێی هەڵدەبژاردن. کاتێك ئەوی بردە ژووری تایبەتیی نـانخواردن بـۆ لای خـۆی، قەشە هێندێك ڕێنوێنیی دیکەی بـۆ هـەنگاوەکانی دواتـر پـێ دا. بەڕێوەبـەری پەرسـتگە بـە دڵاوایییەوە قبووڵی کردن.

ئەو گوتی:" بە هیچ جۆر بۆ من فەرق ناکا کە ئەم بوونـەوەرە شـوومە چـاك بێتـەوە یـان خراپ، بەڵام دوعایە دەکەم هەرچی زووە ئەم پەرستگەیە بەجێ بێڵێ."

باوکە بەڵێنی دا ئەو پەڕی هەوڵی خۆی بەکار بێنێ ئەم کـارەی ئەگـەر لـە مـاوەی چەند سەعاتاندا نەکرا لە ماوەی چەند ڕۆژاندا بکا. کاتێك هەردووکیان بە ڕەزامەندییەکی تەواوە لە ژووری وتوویژی نهێنیدا ماڵاواییان کرد، هیچ کام لەوان بە بیریشیاندا نەدەهات کە تازە قـەت یەکتری نابیننەوە.

هەر واش بوو. باوکە ئاکینۆ کە کۆیلەکان هەر بەو ناوە بانگیان دەکـرد، بـە پێیـان چـووە کلێسا. ئەو لە مێژ بوو کە بە کەمی خەریکی نزایە دەبوو و لە بەرامبەر خوادا بـە مەینـەتیی ڕۆژانەی دووری لە هەرێمی خۆی قەرەبووی دەکردەوە. ماوەیەك لە پەنا دەرگای ڕاوەستا. گوێی بە دەنگ‌و هەرای فرۆشیاران کەڕ دەبوو کە هەموو جۆرە کاڵایەکیان دانابوو، چاوەڕوانی ڕۆژئاوا بوونێ بوو تاکوو بە نێو قوڕو چلپاوی بەنـدەرێدا رابـرێ. شـەکرۆکەی زۆر هـەرزان‌و بلیتێکـی بەخت‌و شانسی هەژارانی کڕی، ئەویش بە خـەیاڵی خـاوی بردنـەوەوە، تـاکوو بتوانـێ کلێـسا تێکڕماوەکەی پێ نوێ بکاتەوە. نیو سەعات کاتی خۆی بـە دەمەتـەقێ لەگـەڵ ئـەو پیرەژنـە ڕەشپێستانەوە خەریك کرد کە وەك پەیکەر لە پشت کارە دەستییە هەرزانەکانیان دانیشتبوون‌و هەموویان لەسەر حەسیری کەنەفی هێندی هەڵڕشتبوون. سەری سـەعات پێـنج بەسـەر پـردی گەڕۆکی گەتسمانیدا تـێ پـەڕی، بـەو شـوێنەدا کـە کـەلاکی سـەگێکی قەڵـەو قەبـەیان لێ هەڵاوەسیبوو کە بە هۆی نەخۆشیی هاری تۆ پیبوو. بۆنی یەکەم سوورەگوڵەکانی مانگی مـای بە بەر لووتیدا هات‌و ئاسمان بێگەردترین بەشی دنیا بوو.

گەڕەکی کۆیلەکان کە ڕاست لە داوێنی ناوچەی زەلکـاوی سـوێری ماریـسما هەڵکـەوتبوو مەینتبەشی قوولەی پێ دەکرد. لە کۆختە قوڕییەکانی بە ﴿ دار ﴾خورما داپۆشـراودا، خـەڵك لەگەل دەنگ‌و قوولەی مریشك‌و بەرازان هاوماڵ بوون. منداڵان ئاویان لە قوولکە قوڕاوییەکانی

شەقام دەخواردەوە. سەرەڕای ئەمەش گەڕەکێکی شادو پڕ لە ڕەنگە تۆخەکانو دەنگی زوڵاڵ بوو، بە تایبەتی لە کاتی ئێواراندا کورسییەکانیان لە دەرێ دادەنان لە نێوەڕاستی شەقام چێژ لەیەکەم فێنکایی هەوا وەربگرن. قەشەی گەڕەك نانی شیرینیی لە نێو منداڵانی ماریسمادا دابەش کردو سێ کوتی بۆ خواردنی شەوێی هێشتەوە.

کلێسا خانووچکەیەکی بە تەڕکی دارە بی بوو کە بانەکەی بە گەڵای دارخورمایە داپۆشرابوو و خاچێك لە بانەکەی بوو. لە نێو خانووەکەدا ڕەحلە دانرابوون کە لە دارێکی قایم بوون، تەنیا تاقە مێحرابێكو تەنیا وێنەیەکی پیرۆز مینبەرێك هەبوو کە ڕۆژانی یەکشەممە قەشەی گەڕەك بە زمانە ئەفریقاییەکانی وەعزی لەسەردا دەدا. ئیدارەی قەشەکان لە ڕاستی کلێساو لەپشت مێحرابێ هەڵکەوتبوو. قەشەی ئەوێ لە خراپترین بارودۆخ لە ژوورێکدا دەژیا کە جگە لە جۆڵلانەیەكو کورسییەکی ئاسایی هیچی دیکەی لێ نەبوو. لە پشتەوە ڕێچکەیەکی سەنگچن و ڕەزێکی ترێی لێ بوو و هێشووی ترێ بە مێوەکانیدا شۆڕ ببوونەوە لەگەڵ حەوشی تەلدڕوو لە جیاتی سنوور لەگەڵ ماریسما. عەمباراوێك ئاوی خورادنەوە کە تەنیا بە ئاوی باران پڕ دەبوو کەوتبووە نێوان دیواری گۆشەی ڕێڕەو.

خزمەتکارێکی پیرو کوڕێژگەیەکی هەتیوی چاردە ساڵە کە هەردووکیان ڕوویان کردبووە ئایینی ماندینگایی لە کلێسا وئیدارەی قەشەکاندا کاریان دەکردو پاش نوێژێ، ئیدی کاریان پێیان نەدەما. بەر لەوەی خزمەتکارە پیرەکە دەرگای داخا، قەشە دواپین لەتە نانی شیرینی بە پەرداخێك ئاوەوە خواردو بە وتەە هەمیشەییەکەی خۆی بە زمانی ئیسپانیۆلی ماڵاوایی لە دراوسێیەکانی کرد:

" خواوەند شەوێکی خۆشو پیرۆز بدا بە هەمووتان."

نزیکی سەعات چوار خزمەتکارە پیرەکە کە لە دووری شەقامێك لە کلێسا دەژیا، هات، تاکوو بۆ یەکەم جار دەنگی ناقووسی یەکەم نوێژ بەرز بکاتەوە. لەبەر ئەوەی قەشە وەدرەنگی کەوتبوو، بەر لە سەعات پێنج چووە ژووری قەشە بۆ ئەوەی بانگی بکا، قەشە لەوێ نەبوو. خزمەتکاری پیر ئەوی لە ڕێڕەوەکەش نەدیت. لە پەناو پەسیواندا هەر وا بەدوایدا دەگەڕا ، جاری وابوو قەشە بۆ گفتوگۆ زووتر دەچووە ڕێڕەوی تەنیشتێ. خزمەتکاری پیر ئەی دۆزیەوە، بە ئەندامانی گەڕەکی کە ژمارەیان کەم بوو ڕاگەیاند چونکە نەیتوانیەوە قەشەی بدۆزێتەوە نوێژ ناکرێ. نزیکی سەعات هەشت، هەتاو گەرم ببوو، کچی خزمەتکار دەیەویست ئاوێ لە عەمباراوێ بێنێ. باوکە ئاکینۆی دیت کە پانتۆڵی خەوێی بەدەستو بەرەو پشت کەتبووە نێو

ئاوێ. ئەمە مەرگێکی خەماوی و پڕئێش و ئازار بوو. مەتەڵۆکەیەک بوو کە قەت نەزانرا و بەڕێوەبەری پەرستگە ئەم رووداوەی بە بەڵگەی بێ ئەملاوئەو لای دوژمنایەتیی شەیتان لەگەڵ پەرستگە لەقەڵەم دا.

هەواڵ نەگەیشتە ژووری سییەرڤا ماریا کە بە هیوای منداڵانەوە چاوەڕوانی باوکە ئاکینۆ بوو. سییەرڤا ماریا نەیدەتوانی بۆ کایەتانۆی باس بکا ئەو کێ بوو، بەڵام پێزانینی خۆی سەبارەت بە گەڕاندنەوەی ملوانکەکانی و سەبارەت بە بەڵێنەکەی بۆ رزگارکردنی ئەو دابووی، بۆ کایەتانۆ باس کرد. تا ئێستا هەردووکیان پێیان وابوو کە ئەوین بەسە بۆ بەختەوەری. ئەمە سییەرڤا ماریا بوو کە پاش ئەوەی لە باوکە ئاکینۆ تەمابڕاو بوو، تێگەیشت کە ئازادبوونی پێوەندیی بەخۆیەوە هەیە. بەیانییەکی زوو، پاش چەندین سەعات یەکتر راموسان بە گریانەوە داوای لە دیلاڤرا کرد نەڕوا. ئەو مەوزووعەکەی بە جیددی نەگرت و بە ماچێك لێی جیابۆوە. سییەرڤا ماریا لە جێوبانێ دەرپەڕی و باوەشی کردەوە و لەپێش دەرگا راوەستا.

" ئەتۆ ناڕۆی، دەنا ئەمنیش دێم."

ئەو جارێکی بە کایەتانۆی گوتبوو، زۆری پێ خۆشە لە سان باسیلیۆ دی پالینکە گوندی کۆیلە راکردووەکان بە دووریی دوازدە مایلیی ئێرە لەگەڵ وی لەبەرچاوان ون بێ، ئەو شوێنەی کە بێگومان وەك شازادەیەك پێشوازیی لێ دەکەن. کایەتانۆ فکرەکەی پەسند کرد، بەڵام لەگەڵ راکردنی وی هاوڕا نەبوو و زیاتر پێی لەسەر رێگە قانوونییەکان دادەگرت. ئەگەر مارکز پشت ڕاستکردنەوەی نەبوونی شەیتان لە لەشی کچۆڵەکەیدا وەرگرتبایە، ئەوی وەردەگرتەوە، و ئەگەر دیلاڤرا لەلایەن ئۆسقۆفەوە لێخۆشبوونی بۆ دەرکرابایە و ئیزنی پێدرابووایە لە کۆڕوکۆمەڵاندا بە جلوبەرگی ئاسایی جێگەی خۆی وەرگرتبایەوە، هەروەك زۆر جار لە زەماوەندە ئایینییەکان و راهیبەکاندا باو بوو، بێگومان کەس هیچی نەدەگوت. کاتێك سییەرڤا ماریا ناچاری کرد بڕیار بدا، کە یان وەمێنێ یان لەگەڵ خۆی بەرێ، کایەتانۆ هەوڵی دا جارێکی دیکە هانی بدا بۆ مانەوە. سییەرڤا خۆی بە ملی کایەتانۆوە هەڵاوەسی و هەڕەشەی کرد دەقیژێنێ. رووناکی داهات. دیلاڤرای نیگەران توانی شتێك بکا و دەرباز بێ، و لە کاتی نوێژی بەیانیدا را بکا.

سییەرڤا ماریا دژکردەوەیەکی توندی نیشان دا. بەهۆی رەفتارێکی نەشیاو، چڕنووکی بە دەموچاوی ژنە ئێشکگرەکەدا هێنا. خۆی لە ژوورێ کوتا و هەڕەشەی کرد ئەگەر ئازادی نەکەن ژوورێ ئاگر تێبەر دەدا و خۆی دەکاتە خۆڵەمێش. ژنە ئێشکگر لەبەر خوێنی دەموچاوی دڵی لەخۆ بۆوە و قیژاندی:

" شەیتانی دلّڕەق، خەیالّت خاوە."

تەنیا وەلاّمی سییەرڤا ئەمە بوو کە دۆشەگیّ بە ئاگری ڕووناکیی ئەمر هەلّ بکا. بەڕێوانیی نارامبەخشی مارتینا پێشی بە کارەسات گرت. پاش ئەمە ژنە ئێشکگر لە ڕاپۆرتی خۆیدا لـە بارەی ئەو ڕۆژەوە پاڕابۆوە کە سییەرڤا ماریای ڕاگوێزن بۆ یەکێك لەو ژوورانـەی پەرسـتگەکە چوونە ژووریان قەدەغەیە.

بێ تاقەتیی سییەرڤا ماریا تینی وەبەر کایەتانۆ نا تا خێـرا ڕێگـا چـارەیەك بدۆزێتەوەکـە واتای ڕاکردن نەدا، ئەو دیسان هەولّی دا تا لەگەلّ مارکیز دانیشێ، هـەردووك جـاران سـەگەل نەیان هێشت لە مالّێی نزیك بێتە، تاکوو بە متمانە بەخۆبوونەوە گەیـشتە خانوویـەکی چـۆل. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە مارکیز ئیدی لەوێ نەدەژیا. بۆ ڕاکردن لە ترسە نەبڕاوەکان هەولّی دا پەنا بەرێتە لای دولچە ئولیڤیا، بەلاّم وەری نەگرت. ئەو هەر لەسەرەتای تەنیاییدا بـە هـەموو ڕێگەیەکدا بە دوای پێوەندیدا دەگەڕا، بەلاّم تەنیا وەلاّمی گالّتەی لەسەر پەڕەسێلکەی کاغەزی وەردەگرتەوە. دولچە ئولیڤیا جارێکی لەنەکاو و بێ ئاگادار کردنەی پێـشتر پەیـدا بـوو. ئـەو ناگردانێکی کە کەلکی لێوەرنەدەگیرا خاوێن کـردەوەو ڕێـكوپێکی کـرد. مەنجـەلّی گۆشـتی کولّیوی لەسەر ئاگری تازە داگیرساو دانا. جلوبەرگی ڕۆژی یەکشەممەی بە تـۆڕی چینـچینەوە لەبەر کردو کرێمی لە دەموچاوی دا. تەنیا شـتێکی نـەگونجاو لـە بەژنوبالاّیـدا کـلاّوی پـانی گەرگەڕی بوو کە نەخشی ماسیو بالّندەی لەسەر دوورابوو.

مارکیز گوتی:" سوپاسـت دەکـەم کـە هـاتی. زۆرم هەسـت بـە تـەنایی دەکـرد." و بـە نارەحەتییەوە قسەکەی تەواو کرد:" سییەرڤا بە فیڕۆ چوو."

دولچە ئولیڤیا وەلاّمی دایەوە:" خەتای تۆیە، ئەتۆ دەستت بۆ هەموو کارێك برد تاکوو ئەو لەدەست بچێ." خواردن بریتی بوو لە ئاشی بیبـەر بـە شـێوەی کـەرئوولی، لەگـەلّ ئـەنواعی گۆشتو گولّچینی سەوزەی باغچە. دولچە ئۆلیڤیا بە شێوەی خانمی مالّێ خواردنەکەی هێنـا، بەوشێوەیەی کە لەگەلّ تایبەتمەندیی خۆی دەهاتەوە. سەگە لەسەر هەستەکان بـە هانکـەهانك وەدوای دەکەوتن، بە نێولاقانیدا ملّومۆیان دەکردو دولچە ئولیڤیا بە دەنگی نزم دەنگی دەدانو لە خۆی دوور دەکردنەوە. ئەو هەر وەك سەردەمی لاوەتی کە ترسیان لـە خۆشەویـستی نـەبوو لەبەرامبەر مارکیز لە پەنا مێز دانیشت، لـە بێدەنگیـدا بـێ ئـەوەی سـەیری یـەکتری بکـەن خەریکی ناخواردنێ بوون بە نارەقەکردنەوە بەلەسەرخۆی ژنومێردێکی پیر سوپیان خوارد. پاش یەکەم دەوری دولچە ئولیڤیا هەناسەی هەلّکێشا و بیری لە سالاّنی ڕابردوو کردەوە.

ئەو گوتی:" ئێمە دەمان توانی ئەوا بین."
ماركیز پێشی بە زیادەڕۆیی ئەو گرت. سەیری كرد، پیرو قەڵەو ببوو، دوو ددانی كەوتبوون‌و چاوەكانی مات بوون. ڕەنگە ئەگەر غیرەتی هەبووایە موخالیفی بابی بووایە، دەیان توانی بەم جۆرە بن.
ماركیز پێی گوت:" ئاقڵ دێیە بەر چاو."
وەڵامی دایەوە:" هەروا بووم. تەنیا تۆ قەتت بەو جۆرە نەدیوم كە هەم."
ماركیز گوتی:" ئەمن لە نێو ئالۆزیدا، كاتێك هەموو جوان‌و گەنج بوون‌و هەڵبژاردنی باشترین كارێكی ئاسان نەبوو، تۆم دیتەوە."
دولچە ئولیڤیا:" ئەوە من بووم كە خۆم بۆتۆ دیتەوە، نە تۆ. تۆ هەمیشە وەك ئێستا بووی: شەیتانێكی داماو."
ماركیز:" ئەتۆ لە ماڵە خۆم، جنێوم پێ دەدەی."
دڵەكوتەیەك كە بەرامبەری بوو تەزووی خۆشیی بە دولچە ئولیڤیادا هێنا:" ماڵ هەر بەو جۆرەی كە پێوەندیی بەوەوە هەیە، بە منیشەوە هەیە. ڕاست وەك كچۆڵەی، تەنانەت ئەگەر لە دێڵە سەگێك كەوتبێتە خوار، ئی منە." و بێ ئەوەی دەرفەتێك بۆ قسان بێڵێتەوە، هەتا كۆتایی درێژەی بە قسەكانی دا.
" لە هەمووی خراپتر ئەوەیە كە تۆ بۆخۆت بە كەسانی ناڕەسەنت ئەسپارد."
ئەو گوتی:" بە خوام ئەسپارد."
دولچە ئولیڤیا بە تووڕەییەوە هاواری كرد:
" بە بەچكە ئۆسقۆفێكت ئەسپارد كە مالۆێران‌و ئاوسی بكا."
ماركیز بە نارەحەتییەوە هاواری كرد:" ئەتۆ ئەگەر زمانت گرێ بدەی مەسموم دەبی‌و دەتۆپی!"
دولچە ئولیڤیا گوتی:" ساگونتا زۆری پێوە دەنێ، بەڵام درۆیان ناكا، هەوڵ مەدە تەسلیمم بكەی، چونكە ئەگەر مردی كەسێكت نیە تۆزت بە سەروسەكوتی داكا."
گفتوگۆ وەك هەمیشە كۆتایی پێ هات. فرمێسكەكانی ئولیڤیا وەك دڵۆپە درشتەكانی سوپ ڕژانە نێو دەورییەكە. سەگەكان وەركەوتبوون كە دەنگ‌و هەرا وەخەبەری هێنان‌و بە وشیاریەوە سەریان هەڵێناو لە گەروویان دا مڕاندیان. ماركێز دەتگوت دەخینكێ.
بە تووڕەییەوە گوتی:" ئێستا دەبینی كە دەمان توانی بەم جۆرە بین."

دولچە ئولیڤیا خوازدنەکەی بە نیوە چڵی هێشتو هەستا. جلوبەرگی لەبەر کرد، بە هێندێك تووڕەییەوە دەوریەکانو سینییەکەی شوردو لە کاتی شوردندا ئەوانی لە مەغسەلەکەدا شکاند. مارکیز تا ئەوکاتەی کە لەتە شکاوەکانی دەفرەکانی وەك تەرزە دەنێو تەنەکەی زبڵیێ کرد، لێی گەڕا بۆخۆی بگریە. ئولیڤیا بەبێ ماڵاوایی ڕۆیشت. نە مارکیزو نەکەسێکی دیکە نەیزانی کە دولچە ئولیڤیا هەتا کەنگێ سەری خۆی هەڵگرتو تەنیا بوو بە خەونی ماڵێ.

ئەم بوختانە کە کایەتانۆ دیلاڤرا کوڕی ئۆسقۆفە، بە ساڵدا چووەکان، لەو کاتەوە کە ئەو دووانە لە سالامانکا یەکتریان خۆش دەویست، هێنایە گۆڕێ. لێکدانەوەی دولچە ئولیڤیا کە لەلایەن ساگونتاوە تەئیید کرابوو وەسەریەك نرابوو، بە کردەوە سەلماندی کە سییەرڤا ماریایان لە پەرستگە حەبس کردەوە بۆ ئەوەی حەزە شەیتانییەکانی کایەتانۆ دیلاڤرا تێر بکاو سییەرڤا ماریا منداڵێکی دووسەری بووە. ساگونتا دەیگوت، ڕووداوی ڕابواردنەکەی وی دە هەموو گەڕەکی کلاریسیەنەکان گەڕاوە.

مارکیز ئیدی قەت چاك نەبۆوە. لە زەلکاوی بیرەوەرییەکاندا نوقم بوو، لە ترسان بە دوای پەنایەکدا دەگەڕاو لە ژێر فشاری تەنیاییدا تەنیا وێنەی بێرناردای هاتە بەرچاو. هەوڵی دا بە بیرکردنەوە، بەو شتانەی کە زیاتر لە هەمووان لە بێرناردا دا هەبوونو رقی لێیان بوو، وێنەی ئەو بسڕێتەوە. هەڵمسانو بۆگەنیوەکان، وەڵامە ژەهراوییەکان، میخەکی لاقیو هەرچی هەوڵی دا دزێو بێتە بەرچاوی، بەو رادەیەش بیرەوەرییەکانی جواتر دەهاتەوە بەر چاوان. تەسلیم لە بەرامبەر حەزو نارەزوودا، بۆ لێکدانەوەی هاتنی بێرناردا بۆ کارگەی پاڵاوتنی شەکری ماهاتێس، کە لە کاتی ڕۆیشتن لە ماڵێ نەگەرەکەی لە گۆڕێ دابوو، و هەرواش بوو، نوێنەرێکی نارد. خەریك بوو رقی بێرناردای لەبیر بکاو بگەڕێتەوە ماڵێو هەر نەبێ هەردووکیان دەیانزانی لە پەنا کێ سەر وەبن گڵی بدەن. چونکە وەڵامێکی لە لایەن بێرناردا وە وەرنەگرتەوە، بڕیاری دا بەدوایدا بگەڕێ.

ئەو دەبووا وەدوای بیرەوەرییەکانی ڕابردووی کەوتبا. ئەو خانووە کە سەردەمێك وەك باشترین خانووی ئیمپراتۆریی پاشانشین سەیری دەکرا، ببوو بە هیچ. بە نێو دڕووەڵانەکاندا دۆزینەوەی ڕێگا ئەقڵ نەی دەبڕی. تەنیا وێرانەیەك لە کارگە مابۆوە، دەزگا ژەنگاوییەکانو ئێسکوپرووسکی دوو گاو لە تەویلەی کارگەی پاڵاوتنی شەکردا وەبەرچاو دەکەوتن. حەوز تەنیا شتێك بوو کە لە بن سێبەردا هێشتا ژیانی بە دارە کالەباسەکان دەبەخشی. بەر لەوەی خانووەکەی بە نێو دڕووەڵاندا بدۆزێتەوە، مارکیز بۆنی خۆشی سابوونەکانی بێرناردای بە

جیددی وەرگرت کە سەرەنجام ببوو بە بۆنی لەشی خۆیو سەیری کرد کە چەندە تامەزرۆی دیداری ئەوە. لە ژێر هەیوانی بن میچیدا چاوی بە بێرناردا کەوت کە لە سەر کورسیی راحەت دانیشتوەو کاکاوێ دەخواو سەیری ئاسۆی دوورە دیمەنێ دەکا. ئەو بالاپۆشێکی رەنگ پەمەییو کەتانیی لەبەردا بوو و هێشتا پرچی بە حەمامی ئارامبەخش تەڕ بوو.

مارکیز بەر لەوەی سێ پلەکانی دوایی دەرگای سەرەکی ببڕێ، رەسمی رێزگرتنی بەجێ هێنا:" رۆژ باش." بێرناردا بێ ئەوەی سەیری بکا وەلامی سەلامی دایەوە، هەروەك كەس نەهاتبێ. مارکیز چووە سەر هەیوانێو لەوێڕا چاوی بە دڕووەلانو هەموو ئاسۆ دوورەدەستەکاندا گێڕا. هەتا چاو هەتری دەکرد، جگە لە دارە کالەباسەکانی قەراغ حەوزێ، تەنیا دڕووە خۆڕسکەکان دەورو بەریان تەنیبوو. مارکیز پرسی:" ئەو خەلکە لە کوێ ماونەوە؟" بێرناردا وەك باوکی، بێ ئەوەی سەیری بکا وەلامی دایەوە:" هەموویان رۆیشتوون. هەتا سەد مایل دەوروبەری ئێرە گیانلەبەرێك شك نابەی."

مارکیز چووە ژوورێ تاکوو شتێك بۆ لەسەر دانیشتنێ بدۆزێتەوە. گۆڕکی مالێ رۆچوو بووو لە نێوان خشتەکاندا گیاوگولی پەمەیی باغچان رووابوون. ژووری نانخواردنێ مێزو کورسیی ئەو سەردەمی لێ بوون کە مۆللارە خواردبوونی. سەعات، خوا دەزانێ کەنگێ راوەستاوەو هەوا لە تۆزێکی نادیار پڕ ببوو کە لە کاتی هەناسەداندا هەستی پێ دەکرا.

مارکیز یەکێك لە کورسییەکانی هەلگرت، لە پەنا بێرناردا دانیشتو بە سەبری گوتی:

" هاتووم لەگەل خۆمت بەرم."

بێرناردا هەروا ئارام بوو. سەری بە حاستەم لەقاند. مارکیز بۆی باسی وەزعی خۆی کرد: مالی بە تەنیا، کۆیلەکان بە چەقۆوە لەپشت دڕووەلانەکان کەمینیان گرتوە،و ئەو شەوانەی نەدەبڕانەوە.

مارکیز گوتی:" ئەمە ژیان نیە."

بێرناردا گوتی:" قەتیش ژیان نەبووە."

مارکیز گوتی:" رەنگە کرابا ببێ."

بێرناردا گوتی:" ئەگەر دەتزانی چەندەت لێ بێزارم، ئەوکات قەت قسەیەکی وات بە من نەدەگوت."

مارکیز گوتی:" ئەمن هەمیشە پێم وابوو لێت بێزارم، بەلام ئێستا بە جارێکی ئاوا دلنیا نیم."

بێرناردا پەردەی لەسەر دەروونی خۆی لا دا تاکوو مارکیز وەك ڕۆژی روون هەموو شتێك ببینێ. ئەو باسی کرد کە باوکی چلۆن بە بیانووی شاماسی و کۆمپووت ئەوی ناردۆتە لای مارکیز،و چلۆن بێرناردا نەیتوانیوە لەو فێڵ و تەڵەکەیەی بابی بگا. بەو جۆرەی بڕیاریان دابوو، ئەگەر مارکیز نەچووەبا لای دەبووا دەستدرێژیی کردبایە سەر،و چەندە بە لەسەرخۆیی و ئامانجدارانە ئەم شانۆیەیەکان ساز کردبوو تاکوو سییەرڤا ماریا لەدایك ببێ و هەتا سەر دەستبەسەر بێ. تەنیا لە شتێکدا کە دەوبووا مارکیز مەمنوونی بێرناردا بووایە ئەوە بوو کە ئازایەتیی دوایین بەڵێنی کە بە بابی دابوو نەبوو، واتە نەی توانی گیراوەی تریاك دەنێو سوپی مارکیز بکا بۆ ئەوەی ئیدی چی دیکە تەحەمولی نەکا.

بێرناردا گوتی:" ئەمن بۆخۆم پەتم خستە ملی خۆمەوە، بەڵام بەداخەوە نەمبوو. داوایەکی زۆر بوو، کە پاش ئەو هەمووە رووداوە، ئەم منداڵە حەوت مانگانەو تۆم خۆش ویستبا، ئەوەش بوو بەهۆی چارەڕەشیی من."

دوایین سووکایەتی پێکردنی پێوەندیی بە ئەسخەر یووتیەوە بوو. بێرناردا یەهوودای لە کەسێکی دیکەدا دەدۆزیەوە، و بەر لەوەی بۆ یەکەم جار بێ و بەبێ هیچ چەشنە کۆسپێك خۆی لە بەرامبەر دەنگ و هەرای کۆیلەکانی کارگەدا تەسلیم بکا، هەستی بە بێزاری لەم کارە دەکرد. بێرناردا کۆیلەکانی بە گرووپ هەڵدەبژارد و لە تەنگەبەری نێو داراندا مشووری دەخواردن، تاکوو هەنگوینی قاڵبۆوەو لەتە کاکاوی ورووژێنەر هەزم بن. بە هۆی زیادەڕۆیی لە خواردنی هەنگوینی کولاّووکاکاو هەڵمساو رووخساری دزێو بوو،و جل وبەرگەکانی بۆ لەشی زۆر قەڵەوبووی تەسك ببوونەوە. پاشان نۆرە گەیشتە دانی هەقدەستەکان. لە پێشدا ئەوانەی جحێلتر بوون هەرکامیان بە گوێرەی توانا و جوانیی خۆیان، کانی زێڕینی بریسکەداری وەرگرت و پاشان ئەوانەی خۆیان تەسلیم کردبوو، زێڕی راستیی پێ دان. بێرناردا زۆر درەنگ تێگەیشت کە کۆیلەکان بە کۆمەڵ چوونە سان باسیلیۆ پالنگە تاکوو خۆیان لە هەوەسی بێ بڕانەوەی وی بپارێزن.

بێرناردا بێ ئەوەی دڵۆپە فرمێسکێك هەڵوەرێنێ، گوتی:" ئەگەر دەمزانی، ئەوانم بە کێردی جەنگەڵی لەنێو دەبرد و نەك کۆیلەکان، بەڵکوو ئەتۆش، منداڵەکە، بابی خۆم، ئەم چاوچنۆکانەو هەموو ئەو کەسانەی گوویان دەژیانم کرد، بەڵام بۆ چما ئەمن لەوێ بووم تاکوو بتوانم کەس بکوژم؟"

هەردووکیان بێدەنگ لەسەر دەرووەڵانەوە سەیری ئاوابوونی خۆریان کرد. دەنگی رەویەك لە ئاژەڵان لە ئاسۆی دووردەستەوە دەهاتە بەر گوێ، دەنگێکی ئارام بێ ئۆقرەی ژنانە ناوی یەکیەکی کۆیلەکانی دێنا، هەتاکوو شەو داهات. مارکیز ئاخێکی هەڵکێشا:

" سەیر دەکەم لە هیچ شتێك دا قەرزداری تۆ نیم."

ماركیز لەسەرخۆ لە جێی خۆی هەستا، دیسان كورسیی لە جێی خۆی دانایەوەو هەر بەو جۆرەی كە هاتبوو بەبێ ماڵاوایی‌و بەبێ چرا ڕۆیشت.

ئەو ڕۆژە مارتینا هەموو كاتی خۆی بە میلدۆزییەوە خەریك كرد، تاكوو كارێكی وەدواكەوتووی تەواو بكا. ئەو نانی نیوەڕۆیەی لە ژووری سییەرڤا ماریا خواردو بۆ پشووی پاشنیوەڕۆیە چۆوە ژووری خۆی. نزیكی شەوێ، لە دوایین قۆناغەكانی دورماندا، بە حاڵەتێكی سەیرو خەماوییەوە قسەی لەگەڵ سییەرڤا ماریا كرد.

مارتینا گوتی:" ئەگەر ئەتۆ ڕۆژێك لەم زیندانە هاتیە دەرێ‌و ئەگەر ئەمن بەر لەتۆ ئێرەم بەجێ هێشت، دەبێ هەمیشە بیرم بكەی، و ئەوەش تاقە دڵخۆشیی من دەبێ."

ڕۆژی دواتر كاتێك ژنە ئێشكگر بەهۆی نەمانی مارتینا لە ژووری خۆی، بە هاتو هاوارەوە ئەوی هەستاند، تازە لە مەبەستی قسەكانی دوێنێ شەوێ گەیشت. ئەوان پەرستگەیان بە وردی پشكنی بەڵام شوێنەوارێكیان لە مارتینا بەدی نەكرد. تاقە هەواڵ بریتی بوو لە پەڕێكی دەستنووسی ڕازاوە بە گوڵ كە سییەرڤا ماریا لەبن باڵنجی خۆیدا دۆزیەوە:" ئەمن ڕۆژانە سێ جار بۆت دەپاڕێمە تاكوو بەختەوەر بی."

سییەرڤا ماریا سەری لەو ڕووداوە لەنەكاوە سوڕ مابوو كە بەڕێوەبەری پەرستگە لەگەڵ جێگرو خوشكانی بەڕێزی دیكە وەك پیادە نیزام لەگەڵ كێشكچییەكی چەكدار بە تفەنگی پلیتەیی گەیشتنە جێ. بەڕێوەبەری پەرستگە توند سییەرڤا ماریای گرت‌و هاواری كرد:

" ئەتۆ هاوكاری ئەوی‌و سزا دەدرێی."

كچۆڵە ئەوندە بە لێبڕاوییەوە دەستی خۆی ڕاپسەكاند كە بەڕێوەبەری پەرستگە لە جێی خۆی وشك بوو.

سییەرڤا ماریا گوتی:" ئەمن هەموویانم لە كاتی چوونەدەردا دیت."

بەڕێوەبەری پەرستگە ڕاچڵەكا.

" بۆ ئەو بە تەنیا نەبوو؟"

" ئەوان شەش كەس بوون."

ئەو قسەیە ئەقڵ نەی دەبڕێ. بەسەر باڵكۆنێشدا نەیان دەتوانی ڕەت بن، چونكە تەنیا ڕێگای ڕاكردن دەرگای ژوورەوەی حەوشێ بوو كە بە توندی بەستبوویان. سییەرڤا ماریا گوتی:" ئەوان باڵی چەكچەكییان پێوە بوو." و دەستەكانی لە هەوادا جووڵاندن. " لەسەر

بالکۆنێ باڵەکانیان کردنەوە. لەگەڵ مارتینا هـەڵفڕینو دوور کەوتنـەوەو گەیـشتنە ئەوبـەری دەریاکان." سەردەستەی کێشکچییە گەڕۆکەکان بە ترسەوە خاچێکی بەسینگی خۆیدا کێشا و چۆکی دادا.

" یا مەریەمی پیرۆز، دایکی خوا."

هەموو لێکڕا گوتیان:" بەبێ تاوان بە پێشوازتەوە هاتین."

ڕاکردنێکی دەقیق بوو. مارتینا کاتێك پێی زانی کایەتانۆ شـەوانی لـە پەرسـتگە دەباتـە سەر، تەواو بە نهێنی پلانی داڕشت. تەنیا شت کە فکری لێنەکردبۆوە یان بۆی گـرنگ نـەبوو داخستنی دەرگای چوونە ژووری تۆنێل لە ژوورەوەڕا بوو، تاکوو کەس پێی نەزانێ. کاتێـك لـە ڕاکردنەکەیان کۆڵیەوە، ئـەو دەرگایـەیان دۆزیـەوە، دەستنیـشانیان کـردو ڕاسـتییەکانیان بـۆ دەرکەوتو خێرا تۆنێلەکەیان لە هەردوو سەریەوە بەست. سییەرڤا مارییایان بـە زۆرەملـی بـە قفڵو بەستەوە بردە لای زیندە بەچاڵەکان. هەر ئـەو شـەوە لـە ژێـر تیـشکی مانگەشـەوێکی بەشکۆدا کایەتانۆ لە هەوڵی کردنەوەی دیواری تۆنێلدا دەستەکانی شکان.

هێزێکی شێتانە تینی وەبەر نابوو. بەغار وەڕێ کەوت تاکوو مارکیز بدۆزێتەوە. بێ ئەوەی لە دەرگایە بدا، بە زەحمەت وەژووری ماڵێکی چۆڵ کەوت کـە حەوشـەکەی وەك شـەقام دەچـوو. دیوارەقسڵییەکانی لە ژێر تیـشکی ڕوونـاکی مانگـدا ڕوونـاك دەهاتـە بەرچـاو. ڕێکـوپێکیی قەنەفەکان، گوڵی نێو گوڵدانەکانو هەموو شت لەو ماڵە چۆڵەدا بە تەواوی هەبوو. جیڕەجـیڕی لاولاوەی دەرگا سەگەکانی ترساند، بەڵام دولچە ئولیڤیا بە توڕەییـەوە ئـەوانی بێـدەنگ کـرد. کایەتانۆ خانمێکی لە بن سێبەری سەوزی حەوشەی ژوورەوەدا دیت، جـوانو گـەش لـە بـەرگی شازادەیەکدا بە بسکی ڕازاوە بە گوڵە بۆنخۆشـەکانی کاملینـەوە. دەسـتی بـەرز کـردەوە، بـە قامکی سەبابەو شەهادە خاچێکی کێشا.

ئەو پرسی:" یا اللە، ئەتۆ کێی؟"

ئەو گوتی:" ئەمن کایەتانۆ دیلاڤرامو هاتووم لە بەرامبـەر بـەڕێز مـارکیزدا چـۆك دادەمو تکای لێ بکەم کەمێك گوێ لە قسەکانم بگرێ."

لە شیددەتی تووڕەیی چاوەکانی دولچە ئولیڤیا بریسکەیان دا.

" بەڕێز مارکیز پێی خۆش نیە قسەی ئینسانی بێ شەرمی گوێ لێ بێ."

" ئەتۆ کێی ئاوا بێ پێچوپەنا قسە دەکەی؟"

ئەو گوتی:" ئەمن شاژنی ماڵێم..."

دیلافرا گوتی:" بۆ خاتری خوا بە مارکیزی بڵێ ئەمن هاتووم لە بارەی کچەکەیدا قسەی لەگەڵ دەکەم."و بەبێ رەسمیاتی زیادی دەستی لەسەر دڵی خۆی داناو گوتی:" ئەمن بە رادەیەکی خۆشم دەوێ دەمرم."

دولچە ئولیڤیا تووڕە بووو دەرگای پێ نیشان دا:" یەك وشەی دیکەت لە دەمی بێتە دەر سەگانت تێ بەردەدەم. برۆ لێرە."

هێزو دەسەڵاتی ئەوەندە زۆر بوو کە کایەتانۆ لە کاتێکدا چاوی لەسەر ئولیڤیا بوو، پاشەوپاش لە دەرگای ماڵێ وەدەر کەوت."

رۆژی سێ شەممە کاتێك ئابرێ نۆنچیکۆ لە نەخۆشخانە چووە ژووری دیلافرا، پیاوێکی رووخاو بەهۆی بێخەویی زۆرو کوشندەی شەوانەی لە پێش چاوی خۆیدا دیت. دیلافرا هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە، لە هۆی راستیی سزایەکەی تاکوو ژووانەکانی لە زیندانێ. ئابرێ نۆنچیکۆ سەری سوڕ ما:

" ئەمن چاوەڕوانیی هەموو شتێکم لیدەکردی جگە لەم کارە شێتانەیە."

کایەتانۆ بە سەرسوڕماوییەوە پرسی:" قەت شتی وات لێ روو نەداوە؟"

ئابرێ نۆنچیکۆ:" قەت کوڕم. دڵداری دیاریە و ئەمن شتی وام نەبووە."

هەوڵی دا بیگێڕێتەوە. دڵداری هەستێکە کە سروشت دوور دەخاتەوەو دوو نەناسیاوان مەحکووم بە بەسترانەوەیەکی بچووك‌و نەساغ دەکا، پێوەندییەکە هەرچی کورتخایەنتر بێ ئەوەندەش پتەوترە، بەڵام کایەتانۆ گوێی بە قسەکانی نەدەدا. ئەو لە فکری ئەوەی دابوو تاکوو لە بەر ستەمی جیهانی مەسیحییەت بۆ دوورترین شوێنی مومکین رابکا.

ئەو گوتی:" تەنیا مارکیز دەتوانێ بە قانوون بە هانامانەوە بێ. ئەمن دەمەویست لە بەرامبەریدا چۆك دادەم بگرێم، بەڵام لە ماڵێ نەم دۆزیەوە."

ئابرێ نۆنچیکۆ گوتی:" ئەتۆ هیچ کات ئەوی نادۆزیەوە، بە گوێی وی گەیشتوە کە تۆ مەرامێکی خراپت بۆ کچەکەی هەبووە. ئەمن ئێستا دەزانم کە لە روانگەی مەسیحییەکەوە هەقیەتی." سەیری چاوەکانی کرد:

" لە مەحکووم کردنی خۆت ناترسی؟"

دیلافرا بێباکانە گوتی:" پێم وایە مەحکوومم ، بەڵام نەك لەلایەن خواوە. ئەمن هەمیشە لەسەر ئەو بڕوایە بووم کە خوا زیاتر لەگەڵ ئەوینە تا لەگەڵ باوەڕ."

ئابرێ ئۆنچیکۆ نەیدەتوانی سەرسوڕمانی خۆی لەو پیاوە کە تازە لە بەستراوەیی ئەقڵ رزگار ببوو، بشارێتەوە. بەڵام هیوای بێ بنەمای پێ نەدەبەخشی. چونکە سەروکاری لەگەڵ ئیدارەی پیرۆزی کلێسا دەبوو.

ئەو گوتی :" ئەتۆ نابینی مەرگت هەیە کە ئازایەتی‌و بەختەوەریی دەروونیت پێ دەبەخشێ تاکوو تەسلیمی بی. ئەمن نە: بە باوەڕی من ئەسڵ، زیندوو مانەوەیە."

کایەتانۆ بە پەلە چووە پەرستگە. ئەو لە رۆژی رووندا بە دەرگای چوونە ژوورەوەی خزمەتکارەکاندا تێپەڕی، بەبێ وەبەرچاوگرتنی رێوشوێنەکان، بە باغیدا تێپەڕی‌و لەو بڕوایە دابوو کە هێزی نزا ئەوی نەبینراو کردوە. چووە نهۆمی دووەم. بە رێڕەوێکی تەسك دا کە بانێکی کورتی هەبوو رۆیشت‌و گەیشتە جیهانی ئارام‌و بەرتەسکی زیندەبەچاڵەکان. بێ ئەوەی بزانێ‌لە بەرامبەر ژوورێکدا رەت بوو کە سییەرڤا ماریای تێدا دەگریا. تەقریبەن گەیشتە ئەوسەری بینای زیندان کە هاوارێك ئەوی لەجێی خۆی راگرت.

" راوەستە!"

ئەو ئاوەڕی وەپشتەوە داو روخساری داپۆشراوی راهیبەیەکی دیت کە وێنەی مەسیحی لە خاچدراوی بە دەستەوە بوو. هەنگاوێك چووە پێش، بەڵام راهیبەیەك پێشی پێ‌گرت‌و هاواری کرد:" وەگەڕێ!"و دیسان هاواری کردەوە:" وەگەڕێ!" ئەو چەند جار بە دەوری خۆیدا سووڕا، سەیری کرد کەوتۆتە نێو بازنەیەکی چەشنی تارمایی چەند راهیبەی رووداپۆشراوەوەو ئەوان بەدەنگ‌و هەراو بە خاچ هەڕەشەی لیدەکەن:

" بگەڕێوە شەیتان."

کایەتانۆ گەیشتبووە خەتی ئاخیرێ. ئەویان تەحویلی ئیدارەی کلێسای پیرۆز دا و لە دادگایەکی ئاشکرای گومانلێکراو بە لە دین وەرگەڕاندا و پەرەپێدان بە ئالۆزیی گشتی، کە ببووە هۆی ناکۆکی لە لە چوارچێوەی کلێسادا، تۆمەتبار کراو مەحکووم بوو. لە سایەی لێبووردنی تایبەتیدا توانی لە پۆستی پەرستاری نەخۆشخانەی ئاموردی دیووس سزاکەی ببینێ، و چەندین ساڵان لەوێ لە پێوەندییەکی نزیك لەگەڵ نەخۆشاندا ژیا. نانی لەگەڵ دەخواردن‌و وەکوو ئەوان لەسەر عەرزی دەخەوت، لەشی خۆی لە تەشتی ئەواندا دەشوورد، دیارە ئەویش بە ئاوی بەکارهاتوو، بەڵام بە ئامانجی نیهایی خۆی کە بریتی بوو لە تووشبوون بە نەخۆشیی گولی، نەگەیشت.

سییەرڤا ماریا لەخۆڕا لە چاوەڕوانیی ئەودا بوو. پاش سێ رۆژان کچۆڵە خۆی لە خواردنێ پاراست‌و دەستی کرد بە سەرپێچییەکی کۆنترۆڵ نەکراو، هەر ئەم کارەش هێزی بە بوونی شەیتان لە

نێو لەشیدا دەبەخشی. پەرێشان لـە وەزعـی کایـەتانۆ، لـە مـەرگی بـێهۆی باوکـە نـاکینۆ، لـە قوولبوونەوەی ئاشکرای چارەڕەشییەك کە ئەقڵو توانای لە نێو دەبرد، نۆسـقۆف ئەوەنـدە بـە تـێنو تاوەوە جندووکە گرتنی کردبووە پیشە کە لە چاو تەمەن و وەزعـی وی جێـی بـاوەڕ نـەبوو. ئـەمجار سییەرڤا ماریایان بە سەری تاشراوو جاکەتی زۆرەملێییەوە ئامادە کردو نۆسقف بـە شـێتایەتییەکی شەیتانییەوە گەیشتە جێو بە زمان.یان قیژەی بالندە جەهەننەمییـەکان دەدوا. لـە ڕۆژی دووەمـدا گابۆڕی زەبەلاحی ئاژەڵە سڵەمیوەکانی بەر گوێ دەکەوت کە عەرزی دەلەرزاند. ئیدی گومانی تێـدا نەما کە سییەرڤا ماریا لە خزمەتی هەموو شەیتانە ژێرزەوییـەکان دایـە. کاتێـك سـییەرڤا ماریـا گەڕایەوە ژووریو بە ناوی تایەبەتی، بە شێوەی فەڕانسەیی ئاوەکەیان تێ کرد تاکوو ئەوەندی بکـرێ ئەو شەیتانانەی لە ژیان دان لە ریخۆلەکانی پاك بکەنەوە.

شەڕ سێ ڕۆژان درێژەی کێشا. هەرچەند سییەرڤا ماریا لـە مـاوەی حەوتوویەکـدا خـواردنێکی نەخواردبوو، بەڵام توانی یەکێك لە لاقەکانی لە بەند دەرباز بکاو بە پانیێ لاقی دەگـونی نۆسـقۆفێ هەڵداو لەسەر عەرزێ تخێل بکا. ئەوکات تێگەیشتن کە کچۆڵە ئەوەندە لاواز بووە کە بەنـدەکانیش ئەیان دەتوانی بیبەستنەوەو ئەو نەیدەتوانی دەستو پێی خـۆی بکاتـەوە. دەنـگو هەرایەکـە بـووە هۆی ئەوەی کێشەکە هەڵسەنگێنن. جندووکە گرتنیان ڕاگرت، ئەنجومـەنی کلێـسا هەڵـسەنگاندنی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام نۆسقۆف دژایەتیی کرد.

سییەرڤا ماریا هیچکات نەیزانی کایەتانۆ چی بەسەر هاتوەو بۆچی ئیدی بە دەرگای سەرەکیدا بە قەرتاڵەی پڕ لە نوقڵەوە لەو شەوانەدا نەهاتەوە کە تێربوونیان نـەبوو. لـە ٢٩ی مـانگی مایـدا، سییەرڤا ماریا بە بێهێزی، دیسان خەونی پەنجەرەی ڕوو بە مەزرای بە بەفر داپۆشراوەوە دیت، بەڵام کایەتانۆی لێ نەبوو، و قەتیش نابێ. لە ئامێزی ویدا هێشوە ترێ بە بۆلووی زێڕینەوە هەبوو کە بە نەخواردراوی هەڵی دەدا. بەڵام ئەمجار سییەرڤا ماریا دەنك دەنك نەی دەخوارد، بەڵکوو هەر جـارەی دوو بۆلوو بە هۆی ئامەزرۆیی زۆرەوە پشووی نوێ دەکـردەوە، تـاکوو هەرچـی زووتـر بـە هـەموو بۆلووەکان ڕابگا. ژنە کێشکچی کە هاتە ژوورەوە تاکوو سییەرڤا ماریای بۆ شەشەمین جار جندووکە دەرکردن ئامادە بکا، ئەوی بە چاوی گەشەکانیەوە، پێستێکی بە ئاسـکیی لەشـی سـاوایان لەسـەر تەختێ دیت کە لە خۆشەویستییان گیانی لەدەستدا بوو. بسکی سـڕی وەك قەڵبـەزە لەسـەر سـەرە تاشراوەکەی قیت بوونەوەو هەڵدانیان بە چاوی دەبینرا.

مامۆستا بینا بە مەودای دیاریکراو مێژووی بەرەنووسەکانی لە دەفتەرچەیەکی قوتابخانەندا دەنووسی و ئێسکەکانی کۆمەڵ کۆمەڵ و بە ڕێکوپێکی لە پەنا یەکتری دادەنا و کاغەزێکی بە ناوی مردووەکەوە لەسەر هەرکامیان دادەنا تاکوو هەڵەیەک روو نەدا. یەکەم شت کە پاش چوونم بۆ پەرستگە سەرنجی رادەکێشا، ریزی دوور و درێژی ئەو ئێسکانە بوو کە بەهۆی هەتاوی گەرمی ئۆکتۆبەرەوە کە لە درزی بانەوە دەهاتە ژوورەوە، گەرمتر داهاتبوون. ناسنامەی هەرکام لەوان بە هۆی یادداشتێکەوە دەناسرایەوە کە بە قەڵەم رەساس لەسەر کوتە کاغەزێک نووسرابوو. پاش تێپەڕینی نیوسەدە هەستم بە شۆکێک کرد کە بەڵگەیەکی راچڵەکێنەر لە رەهەندی ویرانی مێژووەوە لە منی دا پێک هێناوە.

(لە دەقەکەی وەرگیراوە)

چاپخانەی مەشنبیری